# تەڵاقی (سێ بە سێ)
# تەنها (یەك)
# تەڵاقی پێدەكەوێت

ناوی كتێب: تەڵاقی (سێ بە سێ) تەنها (یەك) تەڵاقی پێ دەكەوێت

نوسینی: پرۆفیسۆر دكتۆر موستەفا زەڵمی

وەرگێڕانی: ئەیوب عەلی زەڵمی

تایپ: بڕوا و بەڵێن

دیزاین: هەرمان یاسین

چاپ: یەكەم ـ ٢٠٠٩ ز

ژمارەی سپاردن : (٢٤٥٢) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

# پێشەکی

ئەم نامیلکەیە وەرگیراوە لە - کتێبی تەلاق - ، هۆکاری ئەم وەرگرتنەشمان چەند شتێك بوو لەوانە:-

١- تێکەڵ کردنێك هەیە لە نێوان شەریعەتی ئیسلامی و فیقهی ئیسلامیدا و مەزهەبەکان جێگەی قورئان و سوننەتیان لە کارکردن بە ئیسلام گرتوەتەوە ، کە ئەمەش کارەساتەو لەگەڵ ئەو پەڕی ڕێزدا بۆ پلەی بەرزی زانایانمان کە ئەوان بە باشترین شێوە ئەرکی خۆیان بە جێگەیاندوە و بە تەواوی واتا پابەندبوون بە قورئان و سوننەت و فتواو دادگا (قضاوت)ی هاوەڵانەوە(خوایان لێڕازی بێت) بە پێچەوانەی ئەوەی پیاوانی ئایینی پاش وەستانی (اجتهاد)کە سەرگەرم بون بەزانستە ئامێری یەکانەوە بەدرێژایی ژیانیان ، بەڵام شتی وا مۆڵەتی چاوپۆشی لێکردنی نیە.

٢- خۆ بەستنەوە بە ڕێڕەوێکی (مذهب) دیاری کراوەوە بەپێچەوانەی فەرمانی خوای گەورە کەدەفەرموێت (فآسئلوا اهل الذكر أن كنتم لاتعلمون) واتە پرسیار بکەن لەو کەسانەی شارەزای قورئانن ئەگەر خۆتان شارەزانین . کە ئەوەش سەریکێشا بۆ هەڵوەشاندنەوە و ڕوخاندنی ملیۆنەها خێزان لە سەر بنەمای کەوتنی تەلاقی (سێ بە سێ) بە یەك دەربڕین بە کەوتنی تەواو بە شێوەیەك مولەتێك بۆ گەڕانەوەی خێزانە تەلاقدراوەکە نەمێنێت بۆ لای مێردەکەی مەگەر دوای شووکردن بەکەسێکیتر و جوتبوون لەگەڵیداو دواتر تەلاقدان و تەوابونی عیددەی نەبێت .

٣- هەندێ لە بووێژانی کەوتنی (تەلاقی سێ بە سێ) بە یەکجار ، پەنایان بردوەتەبەر فێڵێکی شەرعی (الحيلة الشرعية) کە ئەویش بریتییە لە بڕیاردان بەسەر ئەو گرێبەستەی پێشودا بەبەتاڵی ، واتە: دەڵێن ئەو بەگوێرەی ڕێڕەوی پێشەوا شافیعی (خوای لێڕازی بێت) پووچەڵە چونکە شایەتەکانی (فاسق) تاوانبار بوون ، پاشان بە پێی ڕێڕەوی پێشەوا ئەبو حەنیفە (خوای لێڕازی بێت)کە ئەو پێی وایە مەرج نیە بۆ دروستی گرێبەستی مارەبڕین، شایەتەکان دادگەر بن لە بەر ئەوەی نزیکەی سەدەو نیوێك بەسەر تافی زێڕینی ئیسلامدا تێپەڕیووە و ڕێڕەوێکی دیاریکراو نیە موسڵمانان پەیڕەوی لێبکەن ، دوای ئەوە سەر لە نوێ گرێبەستێکیتر دادەمەزرێنن و بەخەیاڵی خۆیان ڕزگاریان بووە لەتەلاقە کەوتوەکە، بەتەلاقی سێ بە سێ بەیەکجار .

٤- لە ڕاستکردنەوەی هەڵە بەهەڵە ئەوەی کە بڕیاربدرێ بەکەوتنی (تەلاقی سێ بە سێ بە یەك جار) و پاشان پەنا ببرێت بۆ ئەو شتەی پێی دەوترێ (مارە بەجاش) کە ئەویش مارەکردنی تەلاقدراوەکەیە لە نەناسراوێك بۆ یەك شەو دواتر تەلاقی بدات پاش جووتبوون لەگەڵیدا ، ئەمە ناسراوە بە (مارە بە جاش) لەکاتێکدا کەئەمە نا شەرعییەو پوچەڵ لەبەربەسێ هۆ:

یەکەم: مارەبڕین بەشێوەیەکی کاتی بەتاڵەو دانامەزرێت .

دووەم: مارەبڕین بە مەرجی تەلاقدان پاش جوتبون بەتاڵەو دانامەزرێت.

سێیەم : پایەی ڕەزامەندی هاوبەشی تێدا نەهاتۆتە دی ، چونکە ئافرەتە بەسەزمانە تەڵاقدراوەکە ڕازی نابێت بۆ هەمیشە ئەو کەسە نەناسراوە مێردی بێت ، بە ڵکو بەناچاری و لەژێر فشاردا ملی داوە بۆ ئەو شوکردنە کاتیە.

## حوکمی دەربرینێك ژمارەی تێدا بێت لە تەڵاقدا

قورئانی پیرۆز سێ تەڵاقی دیاری کردووەو دابەشی کردووە بەسەر سێ جار و سێ کاتی جیاوازدا وەك دەفەرموێت (الطلاق مرتان فَإمساك بمعروف أو تسريح بإحسان) ـ (البقرة/٢٢٩) ـــ واتە: تەڵاق دوو جارەو سێیەم یان هێشتنەوەی چاکەیان ئازاد کردنی باش ـ ئەو دابەشکردنەشی بە مەرجێکیتر داناوە لەسەر ویستی پیاو ، کاتێ هەنگاو هەڵدەگرێت بۆ تەڵاقدان بەڵام ئەگەر پیاو پەلەی کردوو بە یەك جار سێ تەڵاقەی دا بۆ نمونە بە خێزانەکەی ووت : (هەر سێ تەڵاقەت کەوتبێ) یان (تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ) یان (تەڵاقت کەوتبێ پاشان تەڵاقت کەوتبێ، پاشان تەڵاقت کەوتبێ ) یان (دە تەڵاقت کەوتبێ) یان (سەد تەڵاقەت کەوتبێ ) یان هەر شێوەیەکیتری لەم جۆرە.

## حوکمی چییە؟

لە ڕاستیدا زانایانی ئیسلام یەك دەنگ نین سەبارەت بەم بابەتە هەر لە سەرەتای ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە تا بە ئەمڕۆ، بەڵکو ناکۆکییە کە بووەتە بابەتێکی پاشەڵ درێژو زۆر تیا وتراوو فرە پەل و پۆ، کە بۆ لێ ئاگادار بوون و هێنانی بەڵگەکانی کاتێکی زۆری دەوێتو فراوانگەیەکی بەرین دەخوازێت.

چونکە ئەمە بابەتێك نییە کەسە و وشکە شوێنکەوتووەکان ئەوانەی هەموو هێزی قورئان دەبەخشنە وتەی زانایان قسەی تیا بکەن و لێکی بدەنەوە ، وەك مەیدانی قسەی نوێخوازە هاوچەرخەکانیش نیە ئەوانەی کە نەرمی و چاوپۆشی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکەنە هۆکاری ئاسانکاری و شلگیری لەهەموو گەورە و بچوکێکی ئیسلامدا.

بەڵکو ئەمە تەنها بابەتێکی زانستیەو بۆ قسەکردن تیایدا پێویست بەوە دەکات لەژێر ڕوناکی قورئان و سوننەتدا بێت بە یارمەتی وەرگرتن لە شوێنکاری هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتوانیان و ڕای هەندێ لەزانایانی ئیسلام ئەوانەی ڕێڕەوی نوسراو و دیاریان هەیە بەبێ خۆ بەستنەوە و دەمار گیری بۆ هیچ ڕێڕەو (مذهب)ێکی دیاری کراو.

## دەگونجێ تێکڕای ڕا جیاوازەکان بکەینە ئەم چوار ڕایە :

١- تەڵاقێك ژمارەی تێدابێت هیچ تەڵاقی پێ ناکەوێت (نە یەك و نە دووان و نە سیان)

٢- چەندی خستبێ ئەوەندەی پێدەکەوێت بۆ ژنێك گوازرابێتەوە ، یەك تەڵاقی پێ دەکەوێ بۆ ژنێکی نەگوازراوە .

٣- چەندی خستبێ ئەوەندەی پێدەکەوێت بە ڕهایی واتە مارە بڕاوەکە گوازرابێتەوە یان نا.

**٤- هەر چەندی خستبێت هەر تەنها یەك تەلاٌقی پێدەکەوێت .**

**بۆ درێژەدان بە باسەکە ئێمە بەگوێرەی ئەو ڕیزبەندییەی لای سەرەوە هەر چوار ڕاکە قسەی لەسەر دەکەین و بەڵگەکانیان ڕوون دەکەینەوەو گفتوگۆیان لەسەر دەکەین ئەویش لە چوار باسی جیاوازدا.**

# باسی یەکەم

## ڕای ئەوکەسەی دەڵێت هیچ تەلاقێکی پێ ناکەوێت

ئەگەر مێردەکەی هەر سێ تەلاقەکەی بەیەکەوە ووت و خێزانی خۆی پێ تەلاقدا بەیەکجار ، بەپێچەوانەی ئەوەی لە قورئان و فەرمودەدا فەرمانی پێ کراوە ، ئەوە حوکمەکەی لای هەندێ لە زانایان ئەوەیە کە هیچ تەلاقێکی پێ ناکەوێت .

- لە کتێبی (الروضة البهية)دا هاتووە : ئەگەر تەلاقێك بەزیاتر لە یەکێك لێکبدرێتەوە وەك ئەوەی وتبێتی : (هەرسێ تەلاقەت کەوتبێ ) ئەو لێکدانەوەیە هیچەو تەنها یەك تەلاقی پێدەکەوێت ، وتراویشە هەمووی بەتاڵەو هیچی پێناکەوێت چونکە داهێنراو و بیدعەیە لەبەر ئەو فەرمودەیەی پێغمبەر ﷺ کە دەفەرموێت : هەرکەسێك سێ تەلاقە بخات ئەوە هیچی نەخستووە ، هەر کەسێك پێچەوانەی قورئان بکات دەگێڕێتەوە بۆلای قورئان، دەبڕێتە سەر ئەوەی کە نەیویستووە هیچ لەسێ تەلاقەکەی بخات.[1]

ئیبنو تەیمیە دەڵێت : هەرکەسێك ژنەکەی تەلاق بدات لەیەك پاکیدا واتە (لەسوڕی مانگانەدا نەبێت) بە یەك ووشە یان بە چەند وشەیەك وەك بڵێ: (هەرسێ تەلاقەت کەوتبێ) بۆ حوکمی ئەوە پێشینان و دواییناني زانایانمان سێ قسەیان هەیەو ئیتر قسەی چوارەم تازەو داهێنراوە و ئەو قسەیەیە کە (موعتەزیلەو شیعە) کان دەیکەن و لە هیچ کەس لەزانایانی پێشینەوە نەبیستراوە کە قسەکەش بریتیە لەوەی کە((بەدەستەواژەی نمونەی سێ تەلاقەت کەوتبێ ، هیچ تەلاقێکی پێ ناکەوێت))[2]

* پێشەوا (ابن القيم) دەفەرموێت : ئەم ڕێڕەوە (ابن حزم) باسی کردووە گێڕراوەتەوە بۆ پێشەوا احمد بەرێزیشی بەر پەرچی داوەتەوە.[3]

* مامۆستا شێخ علي الخفيف دەڵێ :[4] ئەوە ڕێڕەوی دەستەیەکە لە (تابعين) وەك لەیسی کوڕی سەعدو ئیبنو علی و هاشمی کوڕی حەکەم و ابو عوبەیدەوقازی حەجاج ی کوڕی ئەرتەت باسیان کردووە، جەماوەری شیعەش بۆی ڕۆیشتوون.

---

١ الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ، زين الدين العاملي ١٤٨/٢

٢ مجموع فتاوى ابن تيمية ٩/٣٣

٣ زاد المعاد لابن القيم ٥٤/٤

٤ (فرق الزواج ) ص٣٢

**بەڵگەی ئەم بۆچونە:** ئەوەی دەڵێ ئەم تەلاَقە ناکەوێت بەوە بەڵگە دەهێنێتەوە کە کۆکردنەوەی سێ تەلاَق لەیەك دەربڕیندا دژە بەدەقی قورئانی پیرۆز کە دەفەرمێت (الطلاق مرتان فَإمساك بمعروف أو تسريح بإحسان)[1] هەرچیش دژ بە قورئان (بدعة)یە و داهێنراوە وشتی داهێنراویش ڕەتکراوەیە لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کەدەفەرموێ : (من عمل عملاً ليس عليه امرنا فهوَ رد) [2]واتە هەرکەسێ هەستێ بەئەنجامدانی شتێك کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە ڕتکراوەیە .

**تاوتوێی ئەم ڕایە :**

١- ئەوەی کە دژە بە دەقەکە زیادەکەیە لەیەك نەك هەمووی ، کەواتە هەرکات وتی: (سێ تەلاَقەت کەوتبێ) یەك تەلاَقی پێدەکەوێت و زیاترەکەی بەتاڵە، ئەمەش سروشتی هەموو کارێکە کە بگونجێت بۆ دابەشکردن هەندێ بەشی شەرعی دەردەچێت و هەندێکیتری ناشەرعی .

٢- ئیبن حەزم ئەو کەسەی ئەم قسەیەی دەدرێتە پاڵ، ڕای جەماوەری زانایانی وەرگرتووە ، ئەو ڕایەی کە دەڵێت " پیاوەکە چەند تەلاَقی خست ئەوەندەی پێ دەکەوێت بەرەهایی" ، هەروەها دەشڵێت : ئەگەر چەند تەلاَقێك بەیەکجار خستن بیدعە بوایە ئەوا پێویست بوو ڕت بکرێتەوە و بەپوچەڵ بدرایەتە قەڵەم ، بەلاَم بیدعە نیە بەڵکو دروستە هەرسێ تەلاَقە بەیەکەوە بخرێت .

٣- بەڕاستی ئەم ڕێڕەوە (شاذ)ە خەریکە بڵێم پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی تێکڕای مسوڵمانانی لەسەر کۆك و یەك دەنگن ، ئەمەش ڕای شیعەکان نیە وەك (ابن تيمية) دەفەرموێ ڕای زۆرینەشیان نیە وەك مامۆستا (شێخ علي الخفيف) پێی وایە ، بەڵکو زۆربەی شیعە لەسەر پێچەوانەی ئەمەن، طوسي دەڵێت: ((ئەگەر ژنەکەی سێ بە سێ تەلاَقدا بەیەك جار ئەوە بیدعە چیبە ، و یەك تەلاَقی دەکەوێت ئەگەر مەرجەکانی تەواو بوون لای زۆربەی هاوەڵانمان، تیاشیاندایە کە دەڵێت هیچ تەلاَقی پێ ناکەوێت، وەك علي و زاهیریەکانیەکان ))

ئەوەش کە طوسي ئەم ڕایە بەرەهایی دەداتە پاڵ زاهیریەکان هیچ ڕاست نیە وەك لەپێشەوە باسمان کرد .

وەلە کتێبی (رياض المسائل)دا هاتووە : ((ئەگەر سێ بەسێ بەدوو تەلاَق یان سێ لێك بدرێتەوە ئەوە تەنها لەیەك تەلاَقدا ڕاستەو لە سەروی ئەوەوە پوچەڵە وە لەمەوە لاوازی ئەو ووتەیە دەردەکەوێت کە دەڵێت ڕاستەو ڕاست هەمووی باتڵەو هیچی پێ ناکەوێت. مەبەستیش لەدانە دواوە و ڕەتکردنەوە لەفەرموودەکەدا واتە ڕەتدەکرێتەوە بۆلای یەك تەلاَق نەك بۆ لای هیچ))[3].

کەواتە ئەم ڕایە حسابی بۆ ناکرێت چونکە سەرە ڕای ئەوەی بەڵگەیەکی نییە پشتی بگرێت لەگەڵ ئەوەشدا تەنها ڕای چەند دەستەیەکی کەم و نەناسراوە لە زانایان .

---

[1] سەیری کتێبی (الخلاف)ی توسی بکرێت ٢/٨٩

٢ سەیری المحلى ابن حزم زاهیری بکرێت (١٠/١٧٤)

٣ سەیری (رياض المسائل) بکرێت بەرگی دوو کتێبی تەلاَق

## باسی دووەم

## جیاکردنەوەی تەلاقدانی ئافرەتێك گوێزرابێتەوە لەگەڵ ئافرەتێك نەگوێزرابێتەوە

ئەم ڕێڕەوە دەدرێتە پاڵ هاوەڵانی (ابن عباس) و(ئیسحاقی کوڕی راهویە) لەوەدا کە محمدی کوڕی نەسری مەروەزی لێوەی دەگێڕێتەوە لە کتێبی (اختلاف العلماء) دا دەڵێت : هەرسێ تەلاقەکە دەکەوێت ئەگەر ئافرەتەکە گوازرابێتەوە واتە لەگەڵی جووت بوبێت، و یەك تەلاقی دەکەوێت ئەگەر نەگوازرابێتەوە، چەند بەڵگەیەکیش دەهێنێتەوە بۆ ئەوە لەوانە :

١- ئەبو داود لەتاوسەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێك ناوی ئەبو سەهبا بوو زۆر پرسیاری لە (ابن عەباس) دەکرد وتی : ئایا نازانی ئەگەر پیاوێك سێ بەسێ تەلاقی خێزانی بدا با پێش گواستنەوەی لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبەکر و سەرەتای فەرمانڕەوایی عومەر دا یەك تەلاقیان پێ دەخست ؟

ئیبن عەباس ووتی : بەڵێ وابوو بەلام کە عومەر بینی خەڵك بەشوێنیدا دەیهێنن و ڕادێن لەسەری وتی : حسابی بکەن لەسەریان واتە سێ بەسێ دوو بە دوو چەن بەچەن چۆنی ووت وا پێ ی بخەن[1] .

دەڵێن : پابەند کردنی عومەر (خوای لێرازی بێت)بەسێ تەلاقەوە ئەوە بۆ ئافرەتی گوازراوەیە وە فەرموودەکەی (ئەبو صەهبا) بۆ ئافرەتی نەگوازراوەیە، وەبەڕاستی ئەم جیاکردنەوەیەش ڕێکاو ڕێکە لەگەڵ ووتەی گێڕاوە(المنقول)دا لەهەردوو ڕووەوە .[2]

٢- ئەوان دەڵێن : بەڕاستی ئافرەتی نە گوێزراوە (غیر المدخول بها) بە وتەی دەزگیرانەکەی کە بڵێت (تەلاقت کەوتبێ)دەبێتە (بائنة) جیا بوە وە کەئەمەش لەگەڵ (سێ بە سێ) تێدەگیرێن کەواتە ئەو قسەی بووتری سێ تەلاقەی پێ دەکەوێت قسەیەکی پشت گوێ خراوە .

* عەسقەلانی دەڵێت : وا ئاڕاستەیان بۆ دیاریکردووە کە نە گوازراوە دەپچڕێت لەدەزگیرانەکەی ئەگەر پێی بڵێت (تەلاقت کەوتبێ)، کەواتە ئەگەر پێ ی ووت سێ تەلاقەت کەوتبێ ژمارەکە پشت گوێ خراوە چونکە پاش جیابوونەوەکە - بەسەرەتای دەربڕینەکە - ووتراوە[3]

*لە کتێبی (المسبوط)دا هاتووە : ئەگەر بە دەزگیرانە مارەبڕاوەکەی ووت : هەرسێ تەلاقەت کەوتبێ ، هەرسێ تەلاقەی دەکەوێت بەلای ئێمەوە ، کەئەمە قسەی عومەر و علی و ابن عباس و ئیبنو هورەیرەشە. و حەسەنی بەصری دەڵێت : یەك تەلاق دەکەوێت بە وتەی (تەلاقت کەوتبێ) تالە عیددە دابێت ، و حەسەنی بەصری دەڵێت : یەك تەلاق دەکەوێت بەووتەی (تەلاقت کەوتبێ) تالە عیددە دابێت ، وتنی سێ

---

١ سەیری (نیل الاوطار) ی شەوکانی بکرێ (٦/٢٥٩)

٢ (زاد المعاد) ی ابن القیم ( ٥٤/٤ )

٣ فتح الباری صحیح البخاری ( ٣٦٣/٩ )

تەلاّقت کەوتبیّت هیچی پیّ ناکەویّت لەم کاتەدا چونکە ئەو ئافرەتە بە دەربڕین (لفظ)ە کەیتر بیّگانە بووەتەوە بە دەزگیرانەکەی بۆیە بەم سیّ بە سیّ یە هیچ ناکەویّت [10].

**گفتوگۆی ئەم بەلگانە :**

١-وەلاّمەکەی (ابن عەباس) بەگویّری پرسیارەکەیەو حوکمی ئەو باس دەکات ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنیّت کە بڕیاری شەرع بۆ ئافرەتانی گوازراوە جیاوازە لەم حوکمەدا ،بە ڕەهایی هاتنیشی لە فەرموودەکەی (ابن عەباس) دا پشتیوانی ئەم قسەیە دەکات کە دەلّیّت (تەلاّق لە سەردەمی پیّغەمبەر(ﷺ) و ابوبکر) تا دوایی کەدواتر باسەکەی دیّت ، سەرەڕای ئەمەش (شەوکانی)لەکتیّبی (نیل الاوطار) [2]دا دەلّیّت نیسائی دەلّیّت ( ئەم فەرمودەیە نەناسراو (المنکر))ە.

٢- ئەوەی کە بووتریّت ئافرەتەکە دەبیّتە جیابووە وە ( بائنة )بە ووتەکەی (تەلاّقت کەوتبیّ)ئیتر لەسیّ تەلاّقەی کەوتبیّت ژمارەی سیّیە کە پشتگوێ دەخریّت ، ئائەمە پیّچەوانەی نەریت (العرف)و زمانە لەو ڕووە وە کە دەستەواژەی (سیّ تەلاّقەت کەوتبیّ) بەیەکەوە پەیوەستەو لیّتیّگەیشتن لە سەرەتاکەی بەستراوە بە کۆتاییەکەیەوە [3] وە بەلّگە هیّنانەوە پیّ ی وەك بەلّگە هیّنانەوەیە بەفەرموودەی خوای گەورە( لاتقربوا الصلاة ) واتە : لە نویّژ نزیك مەبنەوە ، و پشتگویّ خستنی (وانتم سکاری) واتە : کاتیّك کە ئیّوە سەر خۆشن (کەلەڕاستیدا ئەم جۆرە واتاکردن و لیّکدانەوە یە کارەساتە) [4] کەواتە دەستەواژەی (سیّ تەلاّقەت کەوتبیّ) بەیەکەوە پەیوەستەو ناکریّ بکریّ بە دوو کەرتەوە و بۆ هەر بەشیّکی بڕیاریّك بدریّت وەئەمەش جیاوازە لە دەستەواژەی (تەلاّقت کەوتبیّ، تەلاّقت کەوتبیّ، تەلاّقت کەوتبیّ) چونکە هەموو ڕستەیەکیان سەربەخۆیەو جیایە لەوانی تر وە تیّگەیشتن لە یەکەمیان نەوەستاوە لەسەر دوایی یەکەیان ، وە لەگەلّ وویستی سەر لەنویّ دەسپیّکردن(الاستئناف) دا درووستە کەبووتریّت ئەو ژنە دەبیّتەوە بە بیّگانە بەڕستەی (تەلاّقت کەوتبیّ)ی یەکەمیان وە ڕستەی دووەم و سیّ یەم پشتگوێ دەخریّت .

*لەکتیّبی (اختلاف ابي حنیفه و ابن ابي لیلي) دا هاتووە کە : (ئەگەر پیاو بە دەزگیرانی نەگویّزراوەی بلّیّ : تەلاّقت کەوتبیّ، تەلاّقت کەوتبیّ، تەلاّقت کەوتبیّ، تەلاّق دەدریّت بە تەلاّقدانی یەکەم و دوو تەلاّقەکەی تری بەسەردا نادریّت .وەئەمە قسەی (ابوحنیفە) یشە (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّت)) [5].

---

[1] (المبسوط) ی سەرخەسی ( ٦/٨٨ )

٢ (٩/٢٥٩)

[3] سەیری (فتح الباری شرح صحیح البخاری) (٩/٣٦٣) ، بدائع الصنائع ی کاسانی لاپەڕە (٤/١٨٧٥) بکریّ

٤ وەرگیّڕ

[5] (اختلاف ابي حنیفه و ابن ابي لیلي) ی ئەنصاری لاپەڕە(١٩٢)

## باسی سێ یەم

## قسەی خستنی تەڵاق بە گوێرەی خستنی مێردەکەی

هەندی لە زانایان ، و تابعین، جەماوەری زانایانی حەنەفی[1]، مالیکی[2] ، شافیعی[3]، حەنبەلی[4]، هەندێ لە زاهیریەکان [5]وای بۆی چوون کە مێردەکە چەند تەڵاقی خست ئەوەندە تەڵاقی دەکەون بەیەك دەربڕین ، ئەمەش وەك یەکە بۆ ئافرەتی گوازراوە و نەگوزراوە، و چون یەکە ژمارەکە یەك یان دوو یان سیان بێت. و بەڵگەشیان بەسونەتی پێغەمبەر ﷺ و ئیجماع و قیاس بۆ هێناوەتەوە :

**یەکەم : سوننەتی پێغەمبەر ﷺ :**

بەڵگە دەهێننەوە بەچەند فەرمودەیەك کە گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن :

١-فەرموودەی ڕەکانە : لە ڕەکانەی کوڕی عبد زەیدەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی :(هاتمە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەواوی خێزانەکەمم تەڵاقدا . فەرمووی (مەبەستت پێ ی چیبوو ؟ ووتم: یەك تەڵاق . فەرمووی: (وەڵڵا (توخوا))؟ وتم : وەڵڵا. فەرموی: (دەهەر ئەوەیە کە ویستوتە)[6].

**ڕووی بەڵگە هێنانەوە :**

أ-ئەگەر مەبەستی (ڕەکانە) زیاتر بوایە لەیەکێکیش هەر دەکەوت و پێغەمبەری خودا(ﷺ)پابەندی دەکرد بە مەبەستی خۆیەوە .

---

[1] لە کتێبی المبسوط (٦/٨٨) دا هاتووە (رجل قال لأمرأته ولم يدخل بها انت طالق ثلاثاً تطلق ثلاثاً عندنا)، دووبارە تیایدا هاتووە (٦/٩١): (لو قال لأربع نسوة بينكن تسع تطليقات تطلق كل واحدة ثلاثاً لأن كل واحدة يصيبها بالقسمة تطليقتان و ربع تطلقة) واتە بەشە تەڵاق حوکمی تەڵاقێکە تەواوی هەیە .

[2] لە شەرحی (الخرشي ٤/٣١) دا هاتووە : (ان الزوج اذا قال لزوجته انت طالق ثلاثاً للبدعة أو انت طالق ثلاثاً بعضهن للسنة وبعضهن للبدعة فانه يلزمه الثلاث في المدخول بيها و غيرها)

[3] لە کتێبی المهذب ٢/٨٤ دا هاتووە : (وان قال لغير المدخول بها انت طالق ثلاثاً وقع الثلاث لأن الجميع صادف الزوجية فوقع الجميع كما لو قالة ذليك للمدخول بيها)

[4] لە المغنى ئيبنو قودامة (٧/١٠٢) دا هاتووە : (لو طلقها ثلاثاً في طهر لم يصبها كان ايضا للسنة)

[5] لە( المحلى) ی ئیبن حەزم دا (١٠/١٧٤) دا هاتووە :(ومن قال : انت طالق ونوى اثنتين او ثلاثاً فهو كما نوى سواء قال ذلك ونواه في موطوءة أو غير موطوءة)

[6] ئەبو داود گێڕاویەتەوە و ترمیزی و شافیعیو حاکمیش بە ڕاستیان داناوە . سەیری (تاج الاصول ٢/٣١١)بکە . وەلە (نيل الأوطار ٦/٢٥٥) داهاتووە : (عن ركانة بن عبدالله انه طلق امرأته سهيمة البتة فأخبر النبي (ﷺ) بذلك فقال : والله ما اردت الا واحدة فردها اليه رسول الله (ﷺ ) و طلقها الثانية في زمان عمر ، و ثالثة في زمان عثمان ) شافیعی و ئەبو داود گێڕاویەتەوە .

ب- ئەگەر دروست نەبوایە سێ تەلاقە بەیەك جار بخرێت ، پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیاری مەبەستی چەند تەلاقی لێ نەدەکرد .

**٢- فەرمودەی ئیبنو عومەر :**

دەگێڕنەوە کە یەك تەلاقی خێزانەکەی داوە لە کاتێکدا کە ئەو لە سووڕی مانگانەی خۆی (بێ نوێژی) دا بووە ، پاشان ویستویەتی دوو تەلاقەکەی تریشی بدات لە دوو سوڕی (بێ نوێژی) تردا . ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ کردووە ، سوننەت وایە کە پاك بێتەوە ئینجا تەلاقی بدەیت ......) و وتیشی : پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم کە خێزانەکەم بگێڕمەوە ، منیش گێڕامەوە.پاشان فەرمووی: (کاتێك پاك بووە وە ئەو کاتە تەلاقی بدە یاخود لای خۆت بیهێڵەوە) .ووتم : ئەی پێغەمبەی خودا ﷺ ئەگەر سێ تەلاقەم دابێت پێت چۆنە حەلاڵە بۆم بیگێڕمەوە؟

فەرمووی :(نەخێر ئەوە لێت جیابووە تەوە و بۆشت دەبێتە تاوان )[1]

**ڕووی بەڵگە پێهێنانەوەی :**

بەڕاستی فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە دەفەرموێت :(بێگانە دەبێتەوە و بۆت دەبێتە تاوان) ئەوە دەگەیەنێت کە دروستە خستنی هەرسێ تەلاقە کە بەیەك جار ، بەلاّم ئەوەندە هەیە هەرکەس سێ تەلاقەی بەیەکەوە بخات گوناهبار دەبێت .

( ٣ )- **فەرمووده‌ی عوبادەی کوڕی صامت :** لەداوودەوە لە (عوبادەی کوڕی صامت) ەوە کەووتویەتی:(باپیرم هەزار تەلاقەی خێزانەکەیدا ، باوکم چووە خزمەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسەکەی بۆ گێڕایەوە ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی : باپیرت لەخوا نەترساوە کەئەوەی ووتوە ، سەبارەت بەسێ تەلاقی ئەوە کەوتووە و هی خۆیەتی بەلاّم سەبارەت بە نۆسەدو نەوەدو حەوت تەلاقی ئەوە دوژمنایەتی و ستەمە ، ئەگەر خودا ویستی ئەشکەنجەی دەدات و ئەگەریش ویستی لێی دەبورێت[2] .

( ٤ )- **فەرمووده‌ی عوەیمر :** لەسەهلی کوڕی سەعدەوە دەگێڕنەوە کە ووتویەتی : لەکاتێکدا یەکێك لەنەوەی عجلان(ملاعنە) ی خێزانی کرد بوو ووتی : ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ، ئەگەر لای خۆم بیهێڵمەوە ستەمی لێدەکەم ، تەلاقی کەوتبێ،تەلاقی کەوتبێ،تەلاقی کەوتبێ ، وەلەگێڕانەوەکەیدا : درۆم لەگەڵ کردووە ئەگەر بیگێڕمەوە ، پاشان هەرسێ تەلاقەی دا ، وە لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە (پاشان بەسێ جار تەلاقی دا )[3]. وتویانە : خستنی سێ تەلاق لەبەردەم پێغەمبەری خودا (ﷺ)دا ، وەبەر پەرچ نەدانەوەی لەلایەن پێغەمبەر (ﷺ) ە و بەڵگەیە لەسەر ڕازی بونی پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی .

١ السنن الکبری ی البیهقی ( ٣٣٤/٧ ). نیل الاوطار ( ٢٥٦/٦ )

[2] صحیح مسلم بشرح النووی ، ( ٦٢/١٠ )

[3] سنن النسائی ، ١٤٤/٦

**(٥)- فەرموودەی خاتو عایشە( خوای لێڕازی بێت ):** قاسمی کوڕی محمد لەعایشەوە دەگێڕێتەوە کە : پیاوێك ژنەکەی خۆی تەلاقدا، شوی کردو، تەلاقدرایەوە، پرسیارکرا لەپێغەمبەر (ﷺ): ئایا حەلاڵە بۆ پیاوی یەکەم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (نەخێر مەگەر دووەم شیرینی بچێژی وەك یەکەم چەشتوویەتی) ( واتە پیاوی دووەم لەگەڵیدا جوتبوبێت وەك یەکەم )[1] وتویانە : کەپێغەمبەر (ﷺ) بەرپەرچی ئەم کارەی نەداوەتەوە ، حەرامی کردووە لەپیاوی یەکەم تا پیاوی دووەم لەگەڵیدا نەخەوێت ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە درووستە سێ تەلاق بەیەکەوە بدرێت .

**٦- فەرمودەی محمودی کوڕی لوبەید :** نەسائی لە محمودی کوڕی لوبەیدەوە دەگێڕێتەوە کەووتویەتی : هەواڵی پیاوێك دەداتە پێغەمبەر ﷺ کەهەرسێ تەلاقەی خێزانی داوە بەیەکجار ، پێغەمبەر بەتوڕییەوە هەستایە سەرپێ و فەرمووی :( گاڵتە بەقورئان دەکرێت کەهێشتا من لەناوتاندام ؟) تا پیاوێك هەستایەوە سەرپێ و وتی : ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ)ئەرێ نەیکوژم؟.

ئیبنو کثیر دەڵێت : سەنەدی ئەم فەرمودەیە باشە . حافظ لەکتێبی (البلوغ المرام) دا دەڵێت : ئەو کەسانە ئەم فەرموودەیە دەگێڕنەوە باوەڕپێکراوون[2] .

**ووتویانە :** بەڕاستی توڕەبوونی پێغەمبەر (ﷺ)بەڵگەیە لەسەر کەوتنی هەرسێ تەلاقەکە ئەگینا چ پێویست بەو توڕە بونە دەکات بۆ شتێك کەنەهاتبێتە دی؟ .

**٧- فەرمودەی فاتیمەی کچی قەیس :** کەعەمری کوڕی حەفص ی مەخزومی سێ بە سێ تەلاقی خێزانەکەی خۆی دا ، خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵ چەند کەسێك لەنەوەی مەحزوم چوونە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)عەرزی دەکات : ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو عەمری کوڕی حەفص فاتیمەی تەلاقدا سێ بە سێ ئایا نەفەقەی دەکەوێت ؟ پێغەمبەر فەرمووی : (نەخێر نەنەفەقەی دەکەوێت و نە سوکنا)[3].

**ووتویانە :** ئەگەر هەرسێ تەلاقی نەکەوتایە نەفەقەی دەکەوت ، چونکە نەفەقەی تەلاقدراوێك بەتەلاقی ڕەجعی واجبە لەسەر مێردەکەی بەکۆڕای زانایان ، وەهەروەها سوکنایش واتە دابین کردنی شوێنی ژیان[4].

**٨- فتوای ئیبنو عەبباس بە پێچەوانەی گێڕانەوەکەیەتی :**

ئیبن عەبباس دەڵێت : تەلاق لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) و ابوبکر و دووساڵی فەرمانڕەوایی عومەریشدا سیانی بەیەك تەلاق بوو ، عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی : (بەڕاستی خەڵکی پەلەیانە

---

[1] فتح الباري بشرح الصحيح البخاري ٩/٣٦٢،ا (لسنن الكبرى) ی البيهقي ، ٧/٣٣٤

٢ (ليل الاوطار) ی شەوکانی ( ٦/٢٥٥). ؟ المرجع السابق( ٢/٣١٢ )

٣ سنن ي النسائي ٦/١٤٥ ، صحيح مسلم بەشەرحی نەوەی ١٠/١٠٣

[4] السنن الكبری ٧/٣٣٤

لەشتێکدا کە دەکرێ تیایدا لەسەر خۆ بن ، ئەگەر جێبەجێیبکەین لەسەریان بەسەریاندا جێ بەجێ دەبێت)[5]

**ئیبن عەبباس بە پێچەوانەی ئەم گێڕانەوەی خۆیەوە فتوای داوە :**

(ئەبووداوود ) لەڕێگەی (موجاهید)ە وە دەریکردووە کە دەڵێت : من لە خزمەتی ئیبنو عەبباسدا بووم پیاوێك هات بۆلای و ووتی : کە خێزانەکەی سێ بەسێ تەڵاق داوە ، ئیبنو عەبباس بێدەنگ بوو تاگومانم برد کەژنەکەی دەگێڕێتەوە لای و تەڵاقی بەتەواوی ناخات ، کەچی ووتی : یەکێ لە ئێوە دەردەچێت و توشی لەم جۆرە گەمژەییە دەبێت ، پاشان ووتی : ئەی ئیبنو عەبباس،ئەی ئیبنو عەبباس!! خوای گەورە فەرموویەتی (ئەوەی تەقوای خوا بکات دەرووی لێدەکاتەوە تۆ تەقوای خوات نەکردووە بۆیە هیچ دەروویەکت بۆ نابینم-واتە شتێك نابینم مۆڵەتی گەڕانەوەی تیابێت - وەلەگێڕانەوەکەیدا دەروویەکت بۆ شك نابەم،سەرپێچی خوات کردووە ، خێزانەکەت لێ بۆتەوە بەبێگانە)[1]

زانایان کاریان بەفتواکەی ئەم کردووە نەك بە گێڕانەوەکەی،و وەڵامی ڕیوایەتەکەشیان بەچەند وەڵامێکی زۆر داوەتەوە بەچەند (تأویل)ێك کەهەیانە (تأویل)ێکی نزیکەو هەشیانە دوورە.

گرنگ ترینان بریتیە لە :

١- **ووتویانە :( فەرموودەی ئەو کاتە سیان بەیەك بوو ) شۆڕاوە ( منسوخ )یە .**

- عەینی دەڵێت : (تەحاوی وەڵامی ئەم فەرموودەی ئیبن عەبباسی داوەتەوە بە شتێك کە کورتەکەی ئەوەیە کە مەنسوخە).

**ڕوونکردنەوەکەی :** ئەوەیە کەکاتێك پێشەوا عومەر ووتی : خەڵکینە خودا لەمەسەلەی تەڵاقدا لە سەر خۆیی بۆ داناوون ،(واتە تەڵاق تەڵاق) بەڕاستی هەر کەسێك پەلەی تێدا بکات (واتە هەرسیانی بەیەکەوە خست) ئۆباڵی دەخەینەوە ئەستۆی خۆی وە سیانەکەی پێدەخەین ، کەئەمەی فەرموو کەس بەر پەرچی نەدایەوە و بەرگریکارێك نەبوو بەرگری بکات کەئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر شۆڕانەوەی ئەوەی پێشوو .

تەحاوی دەڵێت : وەك عەینی گواستیەوە :-

ئەگەر بڵێیت ئەم نەسخە چۆن دروستە کەعومەر نەسخی ناکاتەوە ، یان چۆن نەسخ لەدوای پێغەمبەر (ﷺ)ەوە دروستە ؟ دەڵێم کاتێك پێشەوا عومەر ووتاری دا بۆ هاوەڵان باسی ئەوەی کرد و کەس بەرپەرچی نەدایەوە ، ئەوە بووە کۆڕا (الاجماع) دەی نەسخیش بە کۆڕا لای هەندێ لە مامۆستایانمان درووستە بەو ڕێگەی کە کۆڕا پێویستکەر(موجب)ی زانیاری تەواو (علم الیقین)ە .

---

[5] صحیح مسلم سەرچاوەی پێشوو ١٠/٦٩ . سبل السلام ٣/٢٢٥

[1] عمده القاری شرح صحیح البخاری (٢٠/٢٣٣)

دواتـر دەڵێـت : ئەگـەر بڵێیـت ئەمـە کۆڕایـە لەسـەر نەسـخ لـە لایـەن خۆیانـەوە واتـە(بـە بـێ هـیچ بەڵگەیەك)کەواتە دروست نیە شتی وا ، من دەڵێم : ئەگەری ئەوە هەیە دەقێك کـە ئـەو نەسـخەی پێویـست کردبێت لای ئەوان دەر کەوتبێت بەڵام بۆلای ئێمە ئەو دەقە نە گوێزرابێتەوە ).

وە بەیهەقی لە شافیعی یەوە دەگێڕێتەوە (خوای لێڕازی بێـت)کـە ووتویـەتی : بـەوە دەچـێت ئـیبن عـەباس شتێکی زانیبێت ئەوەی نەسخ کردبێتەوە.[1]

**٢- هەندێکیان ووتویانە :** واتای فەرموودەکەی (ئەوکات سێ بەیەك بوو )ئەوەیە کەخەڵکی لەسەردەمی پێغەمبەری خواد (ﷺ )یەك تـەڵاقیان دەخـست چـونکە ئـەوان هـەرگیز سـێ تـەڵاقیان نەدەخـست یـان زۆر بەدەگمەن ، بەڵام لەسەردەمی پێشەوا عومەر دا (خوای لێڕازی بێت)زۆر بەکاریان دەهێنا .

ئەم تەئویلە (ئیبنولعەرەبی)پێشی دەخات و دەیشیداتە پـاڵ (ئـەبو زەرعـەی ڕازی)، وەهـەروەها بەیهـەقیش هێناویەتی بەپشتە(اسناد ) ڕاستەکەی کە دەیگەیەنێتەوە ئەبو زەرعە .

نەوەوی دەڵێت : لەسەر ڕۆشنایی ئەمەدا دەردەکەوێت کە هەواڵەکە لـە گـۆڕانی نـەریتی خەڵکـەوە ڕوویـداوە نەك لە گۆڕانی بڕیاری شەرعی مەسەلەیەکەوە[2].

٣- وەهەنـدێکیان وەڵامیـان داوەتـەوە بـەوەی کـە : لەشـێوەیەکی تایبەتـدا هـاتووە . ئیبنـو سـورەیج و جگەلەویش ووتویانە ئەمە لەوێنەی ئەوەیە کەهاتووە لەباسی دوبـارە کردنـەوەی لـە فـزدا وەك ئـەوەی بڵـێ : تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ ، کەئەوان لەچەرخی یەکەمدا لەسەر پاکی دەرونی خـەڵك ئـەوەیان لێ وەر دەگرتن کە ئەگەر بیانووتایە مەبەست لەدووەم بۆ جەخت کردنەوە بوو لە تەڵاقی یەکـەم، بـەڵام لەسـەردەمی پێـشەوا عومـەر داو کاتێـك فێـڵ و تەڵەکـە لـەناو خەڵکـدا زۆر بـوو پێـشەوا عومـەر (خـوای لێـڕازی بێت)دووەمی بەدووبارە لە قەڵەم داو لەسەری ژماردن کەڕوی دەرەوەی دەربڕینەکەش وایە . وەئـەم وەڵامـەش (قرطبی) ڕازییە پێی و (نەوەوی) یش دەفەرموویێت : بەڕاستی ئەمە ڕاسترینی وەڵامەکانە[3] .

**٤-هەندێکیان وای بۆ چوون تانە بدەن لەگێڕانەوەکەی ( ئیبنو عەبباس )**

* قورتبی لە (المفهم)دا - وەك عەسقەلانی گواستویەتیەوە - دەڵێت : (ناجێگیریەك لەدەر بڕینەکەدا هەیە سەرەڕای ناکۆکی لەگـەڵ ئـیبن عـەبباس دا ، ئـەوەتا ڕواڵـەتی ڕەوەنـد(سـیاق)ە کـەی ئـەوە دەخوازێـت ئـەو گواستنەوەیە لەتەواوی هاوەڵان بێت چـونکە زۆربـەیان ئـەوەیان دیـوە وە ئـەوەش سروشـتییە کـە ئـەم بڕیـار (حوکم)ە بڵاوبێتەوە و خەڵکێکی زۆر بیبیستن ئیتر چۆن تەنها یەك کەس بیگێڕێتەوە لەیەك کەسەوە ؟

---

[1] السنن الكبرى للبيهقى (٧/٣٣٨) ، الروض النضير (٣/١٤٨)

[2] فەتحوالباری ڕاڤەی صحیح البخاری ٩/٣٦٤

[3] فەتحوالباری مەرجعی پێشوو .

دەڵێت : ئەم دیوە ئەوە دەخوازێت کار بەڕواڵەتەکەی نەکرێت ، ئەگەر خوازیاری وەستاندنی یەکجارەکی و بڕیاری تەواو پوچەڵ بونەوەشی بەسەردا نەدات. [1]

* وە ووتویانە : فەرمووەدەکە تەنها (موسلیم) گێڕاویەتەوە و بوخاری نەیگێڕاوەتەوە.

ئەمەو ئیبن عەبباسیش خۆی لە پێچەوانەی گێڕانەوەکە کاری کردووە[2].

و چەند وەڵامێکی زۆر هەیە بۆگێڕانەوەکەی ئیبنو عەبباس کەلێرە ماوەی باس کردنیان نیە هەر کەس بیەوێ زانیاری زیاتری دەست بکەوێ با بگەڕێتەوە بۆ کتێبە پشت پێ بەستراوەکانی فەرمووده [3].

**دووەم : کۆڕا (الاجماع)**

ئەوانەی کە دەڵێن سێبەسێ بەیەك جار دەکەوێت بەڵگەیان کۆڕا یەکی بێ دەنگی گرێدراوی سەردەمی پێشەوا عومەرکوڕی خەتتابە (خ.ر).

وەدەڵێن : بەڕاستی هەواڵی تاکەکەسی (الاحاد) ئەگەر ئەوە بگەیەنێت کەتەنها یەك تەلاقی پێ دەکەوێت (واتە سێبەسێ کە)ئەوە هیچ کات لەتوانایدا نیە لە بەردەم بەڵگە هێنانەوەی کۆڕا (الاجماع) دا بوەستێتەوە (کە دەڵێت هەر سێ ی دەکەوون).

ئیبنو حەجەر دەڵێت[4]:(ئەوەی لەم مەسەلەیەدا ڕویداوە کتومت لەوێنەی ئەوەیەکە لەمەسەلەیەی چێژ(متعه) دایە دەی لەپێشتر لەهەردوو شوێنەکەدا یاساغ (تحریم) کردنی نیکاحی و خستنی سێ تەلاقەیە بەیەك جار ، لەبەر ئەو کۆڕا یەی گرێدرا لە سەردەمی پێشەوا عومەردا(خوای لێڕازی بێت)لەسەری ،وەنەشبیستراوە تەنها کەسێك دژی یەکێك لەم دووانە وەستابێتەوە).

سێیەم- بەڕاستی تەلاق مافێکە لە مافەکانی پیاوەکە کەواتە بۆی هەیە هەرسیانی بەیەکجار بخات بەبەراگرتن (القیاس) لەسەر مافەکانی تری ، لەکتێبی (المغنی)[5] دا هاتووە : (وەلەبەر ئەوە کە نیکاح موڵکە دروستە لابردنی بە پەڕاگەندە یان پێکەوە وەك هەر موڵکێکی تر).

وە هەروەها گرتویانە بە بەر نەزرو سوێندا(واتە قیاسیان کردووەتە سەر ئەوان).

ئیبن ڕوشد [6] دەڵێت : هەرکەسێك تەلاقی چوواندووە بەو کردارانەوە کە بەمەرج دەگیرێ بۆ دروستی کەوتنیان بونی مەرجە شەرعییەکان تیایادا وەك نیکاح و مامەڵە ووتویەتی : نایەتەدی (واتە چەندی

---

[1] بۆگەڕاوە (المرجع) ی پێشوو ...

٢ زاد المعاد ٤/ ٦٠

[3] وەك فەتحوالباری سەرچاوەی پێشوو. عومدەتولقاری سەرچاوەی پێشوو ٢٠/ ٢٣٣-٢٣٤ ،نیل الاوطار ( ٦/ ٢٦٢-٢٦٣) ، سبل السلام (٢/ ٢٢٦ ).

٤ فەتحولباری ٩/ ٣٦٥.

٥ المغنی و الشرح الکبیر ٨/ ٢٤٣ .

[6] بدایة المجتهد و نهایة المقتصد ٢/ ٥١

خەندی خستبێ بە ڕەهایی ناکەوێت)، و هەرکەسێك چوواندویەتی بە نەزر و سوێندێکەوە کە هەر کەسێك لەسەر خۆی پێوست بکات دەبێت پێوەی پابەند بێت بەو شێوەی کەلەسەر خۆی پێویست کردووە ئەوە تەلاقیش لای ئەو دەکەوێت بەو شێوەی کە تەلاق دەرەکە بۆخۆی ویستووە(واتە چەندی خستووە ئەوەندەی دەکەوێت)[1].

## گفتوگۆی ئەم بەڵگانە :

١-هیچ بەڵگەیەك نیە لەفەرموودەکەی (ڕەکانە)دا : بەشێوەیەك زۆرێك لە زانایانی فەرموودە پێیان وایە گێڕانەوەکە سەراپای ناجێگیرە یان نا دروستە،وەلە پشت(اسناد)ە کەیدا خەڵکی نەناسراو و تانە لێدراو هەیە . وە لەبەر ئەوەش کە گێڕراوەتەوە بەچەند گێڕانەوەیەکی لێك جیاواز و چەند پشت(اسناد) یکی دور لەیەك .

* شەوکانی دەڵێت : (ترمیزی ووتی پرسیارم کرد لە محمد مەبەستی لە(بخاری)یە سەبارەت بەوە لەوەلامدا ووتی (ناجێگیری تێدایە) پاشان شەو کانی درێژە بە ووتەکانی دەدات و دەڵێت : بەڕاستی زیاد لەیەك کەس پێیان لاوازە و وتراویشە هەر واز لێهێنراوە وە(ترمیزی)لە (بخاری) ە یەوە باس دەکات کە ئەو گێڕانەوەیە ناجێگیری تێدایە ، جارێك سێ بەسێ و جارێکی تر یەك تەلاقی تیا وتراوە...وە هەر لەگەڵ لاوازییەکەیشیدا ناجێگیرە ....)[2]

* ابن تیمیە دەڵێت :(پێشەوایانی گەورەی شارەزا لەنەخۆشیەکانی فەرموودە و فقە لەوێنەی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو،جگە لەمانیش و ، ئیبنو عوبیدەو، ئیبن و حزم ، جگە لەویش ئەم فەرموودەیان بەلاواز داناوە ، وەڕونیان کردووەتەوە کە گێڕانەوەکانی نەناسراون و دادگەری و لەبەر کردنیان نەزانراوە)[3]

* لەکتێبی (اغاثة اللهفان)[4] دا هاتووە (ئەو فەرموودەیە فەرموودەیەکی نادروستەو ئەبوفەرەجی جەوزی لە کتێبی (العلل)ە کەیدا دەڵێت : پێشەوا ئەحمەد ووتویەتی : (ئەو فەرموودە فەرموودەیەکی نە چەسپاوە) و(خلال) لەکتێبی (العلل)ە کەیدا لە ئەسرەمەوە دەڵێت ووتم بە ئەبو عبداللە فەرموودەی ڕەکانە هەر لە بنەمادا ئەو بەلاوازی دانا).

* لەکتێبی زاد المعاد[5] دا هاتووە :(بەڕاستی بوخاری شایەتی دا کە ناجێگیر (الاضطراب)ی تێدایە ،و پێشەوا ئەحمەد دەڵێت : هەموو ڕێگاکانی ئەم فەرموودە یە لاوازن). وەلە(مسند)ی پێشەوا ئەحمەد دا بە ژمارە(٢٣٨٧)هەیە : (لە ئیبنو عەبباسەوە کە: ڕەکانەی کوڕی عەبد یەزیدی برای موتەللیب ژنەکەی خۆی

---

[1] وەرگێڕ

[2] بۆ درێژەی زیاتر بڕوانە (نیل لوطار شرح منتقی الاخبار من الاحادیث سید الاخیار)ی شەوکانی ٢٥٥/٦ و دوای ئەو ....

٣ سەر لە (مجموع الفتاوی ابن تیمیة ١٥/٣٣) بدە

٤ (٣) ٣٣٣/١

[5] زاد المعاد لابن القیم ٥٩/٤

تەڵاقـدا بەسـێ بەسـێ لەیـەك نیـشتگە(مجلس)دا دواتـر خەفـەتی زۆر پێخـوارد و بـۆی بێتاقـەت بـوو ، پێغەمبـەر(ﷺ)پرسـیاری لێ کـرد (چـۆنت تەڵاقـدا) ووتـی : سێبەسـێ تـەڵاقم دا ، فـەرمووی :(لەیـەك نیشتگە(مجلس) دا؟) عەرزی کرد :بەڵێ . فەرمووی :(دەی ئەوە یەك تەڵاقە ئەگەر دەتەوێ بیگێڕەوە) ووتـی : ئیتر گێڕامەوە)

لەگێڕانەوەیەکدا ئەوەیەك تەڵاقە و بێگەڕێنەرەوە ئەگەر دەتەوێ ئەویش گەڕاندیەوە .

وەسەرەڕای هەموو ئەمەش خەڵکی مەدینـە بەسـێ تەڵاقـەیان دەووت تـەڵاقی یـەکجارەکی لـەژێر ڕۆشـنایی ئەمەدا فەرمودەی (ڕەکانە) واتای ئەوە ناگەیەنێت کە تەڵاقی سێ بە سێ بەیەکجار هەرسیانی پێ بکەوێت.

**٢- فەرمودەی ئیبن عومەر بەڵگەی تیانیە :**

چونکە ئەو زیادەیەی کەجەماوەر (جمهور) دەیکەن بە بەڵگـەی کـەوتنی سـێ تەڵاقـە بەیـەکجار تـەنها یـەك کەسیش لەزانا متمانە پێ کراوەکان پێ ی وانەبوە.

وەلـە ڕێگـەی مـالیکی کـوڕی نافیعـەوە لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەرەوە هـاتووە (فـەرمانی پـێ بکـە بابیگێڕێتەوە پاشـان گلـی بداتـەوە لای خـۆی تـاوەکو پـاك دەبێتـەوە و دواتـر دەکەوێتـە سـوڕی مـانگانـەی خۆیەوە، دوای ئەوە ئیتر ئارەزوی خۆیەتی لای خۆی دەیهێڵێتەوە یان تەڵاقی دەدات پێش لا قەکردنی، وەهەر ئەوە ئەو ژماردنە(العدة)یەیە کەخوا فەرمانی کردوە ئافرەتی تیا تەڵاق بدرێت ).

- وەلەڕێگەی ئەنـەس ی کـوڕی سـیرینەوە هـاتووە : ئیبنـو عومـەر ژنەکـەی تـەڵاق دا لەسـوڕی مـانگانـەی خۆیدابوو ، پێـشەوا عومـەر لەخزمـەتی پێغەمبـەر دا(ﷺ)باسـی کـردو ئـەو فـەرمووی : (بابیگێڕێتـەوە) عەرزم کرد حسابی دەکات ؟ فەرمووی : (نابێت ئەگەر تەڵاقەکە حسێب نـەکات)[1]. - وەلەڕێگـەی ئیبنـو جوبەیرەوە، هاتووە (بابیگێڕێتەوە) ووتم (دەیژمێرێت؟) فەرمووی (ئەی چۆنە بەلاتەوە ئەگەر دەستەوسان و خۆگێـل کـەر بێـت) ؟ واتـە خۆشـێت یـان منـداڵ نیـە تـا تـەڵاقی نەکـەوێت [2] وەهـەروەها لـەکۆی ڕێگـە دروستەکانی تردا ئەم زیادەیەی تیانیە کەبریتی یە لە (ئـەی چـۆنە ئەگـەر هەرسـێ تەڵاقـەی دابێـت)ئـەوەی کەجەماوەر (جمهور) کردوویانە بەبەڵگە[3]. پاشان لەئیسنادی فەرموودەکـەدا (شـوعەیبی کـوڕی زەریعـە) هەیـە کـەلاوازە وە(مـەعلای کـوڕی مەنـسور) هەیـە کەپێـشەوا ئەحمـەد پـێی دەڵـێ درۆزنـە، وە (عـەتای خوراسانی) هەیە کەلاوازە.

**٣- هیچ بەڵگەیەك لەفەرموودەی عوبادەی کوڕی صامیتدا نی یە :** چونکە گێڕەرەوەکانی یان نەناسراوون یان لاواز، ئیبنو قەیم دەڵێـت : (بـەڵام سـەبارەت بـە بەڵگـە هێنانـەوەتان بەوفـەرموودەی عوبـادەی کـوڕی

---

١ عمده القاری بەشەرحی صحیح بوخاری نوسینی العینی، بۆ گەڕاوەی پێشوو ٢٠/٢٢٨

٢ بۆگەڕاوەی پێشوو

٣ بۆ زیاتر ئاگاداری شارەزای بڕوانە (عمدة القاري) هەمان سەرچاوەی پێشوو باسی تەڵاق)

صامت كه عبدالرزاق گێراویەتیەوە ئەوە هەواڵێكە لە لوتكەی تێشكان و فرێداندایە چونكە لـە ڕێگەیدایـە (یەحیای كوڕی عـەلا لـە عوبەیـدواللە ی كـوڕی وصـافی یـەوە لـەئیبراهیـمی كـوڕی عبـداللە) وە كـەلاوازە لەمالیكەوە نەناسراوە . پاشان ئەوەی كەبەڵگەیە لەسەر پوچەڵی و درۆی ئەو فەرموودەیە ئەوەیە كەنـەزانراوە لەهیچ شوێنكارێكی (الاثار) دا سـاغ یـان ناسـاغ ، پەیوەسـت یـان پـچڕاودا ، كـەباوكی عوبـادەی كـوڕی صامت بەسەردەمی ئیسلام دا ڕاگەیشتبێ چ جای باپیری ؟!!! كەئەمەش بەدڵنیاییەوە مەحاڵە)[1].

**٤- دروست نیە بەڵگە بهێنێرێتە وە بە فـەرموودەی عومـەیری عـەجلانی** : چـونكە ئـەو كەسـەی بەڵگـە دەهێنێتەوە بەم فەرموودەیە ئەگەر لەوانـە نـەبێت كـەدەڵێت جیابونـەوە ڕوو دەدات كـەمێك دوای لەعنـەتی مێردەكە بەتەنیا دەست بەجێ وەك لەڕێڕەوی (مەزهەب) شـافیعی دا هەیـە ، یـان پـاش كـەمێك لەعنـەتی هەردوكیان وەك یەكێك لە گێڕانـەوەكانی پێشەوا (ئەحمـەد )دا هـاتوە ، دەی بەڵگـە هێنانـەوە بەمەپوچـەڵە چونكە تەلاقدان لەو كاتەدا بێ بایەخ وپشت گوێ خراوە .

- جەصاص وتویەتی : (بۆ شافیعی مەزهەب درووسـت نیـە بەڵگـەی پێبهێنێتـەوە چـونكە لـە ڕێڕەوەكـەی خۆیدا هەیە كە : جیابونەوە ڕوودەدات بە لەعنـەت كردنی مێردەكە پێش لەعنەت كردنی خێزانەكەی وەلێی دەبێتەوە بەبێگانە ، و هیچ تەلاقێكی شوێن ناخرێت ، ئیتر چۆن بەرپەرچی تەلاقێك دەداتـەوە كەنەكـەوتووە و بڕیارەكەی نەچەسپاوە )[2] .

- ئیبن قودامە دەڵێت (بەلاّم فەرمودەی لەعنەت (نـەفرەت) لەیـەك كـردن هـیچ شـتێك پێویـست نـاگێرێ چونكە جیابونەوەكە بـەهۆی تەلاقەكـەوە نیـە ، وەتـەنها بەنـەفرەت لەیـەكتركردن ڕوودەدات و بـەڵكو لـەلای شافیعی تەنها بە نەفرەت كردنی مێردەكە لە خێزانەكەی ڕوودەدات كەواتە هیچ بەڵگەیەكی تێدانیە[3].

وەهـەروەها مـافی بەڵگـە هێنانـەوە پـێ ی نادرێـت بـەو كەسـەی كەجیابونـەوە كـە لەمولاعەنـەدا لـەپاش نەفرەتكردن بەمەرج دەگرێت لەلایەن فەرمان ڕەوا (حـاكم) ەوەبێـت چـونكە ئـەم گـرێ بەسـتی نیكاحـە بـە بەردەوامی نەماوە بەڵكو پێویستی كۆتایی پێهێنانی چەسپاوە وەبۆ هەمیشە لەمێردەكـەی حـەرام دەبێـت . وەهەر ئەمە ڕای دروست و لەپێشترە وەك فەرموودەكەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)دەیگـەێنێت (المتلاعنـان لا يجتمعان أبداً) [4]واتە ژن مێردی نەفرەت كەر لەیەك بۆ هەمیشە لێك دەبڕێن و پێكە وە كۆ نابنەوە .

---

١ سەیری زاد المعاد بكرێت (٤/٥٩)

٢ سەیری أحكام القرێن پێشەوا رازی الجصاص (٢/٨٠-٨١ )

٣ المغنی والشرح الكبیر ( ٨/٢٤٢ )

٤ نیل الاوطار (٦/٢٤٢)

بەڵام سەبارەت بە تەڵاقدانی سێ بە سێ لەلایەن نەفرەت کەر (المتلاعن) ەوە بەڕاستی ئەوە بۆ دڵنیابونە لەوەی کەڕازی یە بەوحەرامبونەی کەلەنەفرەت کردن (اللعان) ە کەوە بەدی هاتووە . واتە خێزانەکەی لێ حەرامبوەتەوە ..

- ئیبن قودامە دەڵێت : (بەڕاستی خودی نەفرەت کردن حەرامبونی هەمیشەیی پێویست دەگێڕێت ، ئیتر تەلاّق بەشوێنی ئەودا وەکو تەلاّقی پاش هەڵوەشانەوە(انفساخ) ی نیکاح وایە)[1].

- ئیبنو لقەیم دەڵێت : (بەڵام سەبارەت بەبەڵگەهێنانەوەتان بەوەی کەنەفرەتکەر هەرسێ تەلاّقەی خێزانەکەی داوە بەئامادەبونی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه و سلم) ئەو فەرمودە دروست (صحیح) نیە ، وەئای چەند دوریشە لەبەڵگەهێنانەوەتان لەسەر ئەوەی گوایا دروستبێ سێ تەلاّقە بەیەك ووشە بەیەكجار بخرێت ... پاشان ئەوەی بەڵگە دەهێنێتەوە بەوە ئەگەر لەو جۆرە کەسانە بێت کەدەڵێت جیابونەوەکە پاش کەمێك لەنەفرەت کردنی ژن و مێردەکە ڕوودەدات هەرچەند حاکمیش بڕیاری لەسەر نەدابێت وەك لەیەکێك لەگێڕانەوەکانی پێشەوا (أحمد) دا هاتووە ،ئەوا ئەو بەڵگەهێنانەوەیە پوچەڵ (باطل) ە ، چونکە تەلاّقی سێ بە سێ لەم کاتەدا پشتگوێخرا (لغو) وە و هیچ سودێکی نی یە ، وەئەگەر لەو کەسانەش بێت کەجیابونەوەکە بەند دەکەن بەبڕیاری حاکمەوە ئەوە دیسانەوە بەڵگە هێنانەوەکە کەڕاست نیە ، چونکە ڕێگایەك بۆمانەوەو بەردەوامی گرێبەستی نیکاحەکە نەماوە ، بەڵکو شتێکی مسۆگەرلاچووی بۆ هەمیشە حەرامبووە (واتە خێزانەکەی) ، ئیتر تەلاّقی(سێ بە سێ کە) بۆ جەختکردنەوە یە لەمەبەستی نەکردنەکەو چەسپێنەر و دانپێدانەریەتی )[2]

**٥- بەڵام سەبارەت بەفەرمودەی خاتوو عایشە ( خوای لێڕازی بێت ):** هیچ کات ئەوە ناگەیەنێ کەتەلاّقی سێ بە سێ بەیەکجار هەر سیانی دەکەوێت ، بەڵکو ئەوە دەگەیێنێت کەئەو ژنە مێردەکەی هەرسێ تەلاّقی داوە . وەئەم قسەیەش ڕونە لەوەدا کەشێوەی تەلاّقی شەرعی ئەوەیە کەتەلاّق جار لەدوای جار بێت ، بەبەڵگەی بەرپەرچ نەدانەوەی لەلایەن پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیه و سلم ).

ئیبنو لقیم دەڵێت : (لەکوێی فەرمودەکەدا هەیە کەهەرسێتەلاّقەی بەیەکجار دابێت بەیەك دەربڕین ، بەڵکو فەرمودەکە بەڵگەیە بەدەست ئێمەوە ، چونکە ناووترێ سێ جار ئەوەی کرد یان سێجار ئەمەی ووت تەنها مەگەر ئەمەی کردبێت بەجار لەدوای جار وەهەرئەمەش ڕێ ی تێدەچێت لەزمانی گەلاندا بەعەرب و عەجەمەوە ، وەك چۆن دەووترێ سێ تۆمەتی دایە پاڵ ، سێ جنێوی پێدا ، سێ سلاّوی لێ کرد (واتە سلاّوێك پاشان سلاّوێك و دواتر سلاّوێکی سێیەم)[3]

---

[1] المغنی والشرح الکبیر سەرچاوەی پێشوو.

٢ زاد المعاد إبن القیم ٤/٥٨

٣ زاد المعاد بۆ گەڕاوەی پێشوو ٤/٥٩

**ئـیبن حەجـەری عەسـقەلانی دەڵێـت** [٤] : ( هەڵـدەگرێت کەمەبەسـت تیایـدا ئـەوە بێـت کەتـەلاٌقی داوە بـە تەلاٌقدانێك کەپێکەوە پچرانیانی لێ بەدی هاتووە،کەئەمە گشتگیر تـرە لـەوەی سـێ تەلاٌقـەی داوە بەیەکـەوە یان بەجیا، وە پشتی ئەم دووەمە دەگرێـت ئـەوەی کـەدواتر دێـت . لەڕویـەکی تـرەوە کەئـەو ژنـە ووتویـەتی تەلاٌقی دام بە دوا سێ تەلاٌقە).

**٦- فەرمودەی مەحمودی کوڕی لوبەید زیانی بۆ بەرامبەرەکانە نەك بەقازا نجیان بێت :**

ئەم فەرمودەیە بەیەکێك لە بەڵگەکانی نادروستی کۆکردنەوەی هەر سێ تەلاٌقە لەیەك جـاردا دەژمێررێـت ، وەهیچ کات نابێتە پشتیوانی ئەو کەسەی کەئەوە بەدروست دادەنێت لەو ڕووەوە کەهەرگیز پێغەمـبەری خـوا (ﷺ ) بێدەنگ نابێت بەرامبەر بەکارێك گاڵتەو بەسوك سەیرکردنی بەقورئان تێدا بێت.

**- لەکتێبی (اغاثة اللهفان) دا هاتووە :** (بەڵگە پێ هێنانەوەی لەسەر ئەوەی دروست بێ هەرسێ تەلاٌقەکـە بەیەکەوە بخرێت، لەخانەی ئاوەژووکردنی ڕاستی یەکانە، وە زیاتر بەڵگەیە لەسەر یاساغی وەك لـەوەی کـەرێ بەدروستی بدات . وەکردنە بەڵگەشی لەسەر کەوتنی تەلاٌقەکە دەچێتە خانەی پێشبینـی و خەملاٌندنەوە بەلاٌم خۆ شوێنکەوتە(المقلّد) گوێ ناداتە چۆن سەرگرتنی شوێن کەوتنەکەی بەهەر شێوە دەست بدات و بۆی بێتە پێش ، وەگوێشناداتە ئەوەی چ گومـانێـك بـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـراوە لـەو ڕوەوە کەئـەم بـەم کـارە شـتێکی بەڕاست زانیوە گوایە کەپێغەبەر (ﷺ) ڕێیداوە بەکارێك کە تیایدا سـوکایەتی بـە قورئـان کـراوە ، بـەڵکو ئەمە وائەزانێت ئەمە لەشەرعەکەی ئەودایەو بڕیاری ئەوی (ﷺ)لەسەرە وجێەجێیشی دەکات)[١] . وەسـەرەڕای ئەمەش فەرمـودەکە تانە لێدراوە- ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەڵێت: (محـمـودی کـوڕی لوبەیـد لـەدایکبوی سـەردەمی پێغەمبـەرە (ﷺ) لەبـەر ئەوەیـە کـە پێغەمبـەری خـوای (ﷺ)دیـوە ، نەسـائی لـەپاش دەرکردن(تخريج) ی دەڵێت : وانازانم یەك کەس ئەم فەرمـوودەی گێڕابێتەوە جگە لە (مخرەمەی کـوڕی بکـیر) لەباوکییەوە......وەوتراویشە ئەویش لەباوکییەوە نەیبیستووە...پاشان عەسقەلانی درێژە بەووتـەکانی دەدات و دەڵێت : لەسەر گریمانەی ساغی و دروستی فەرمـوودەکەی مـەحمودیش ، خۆ هیچ ڕونکردنەوەیەکی تێدا نیـە ئایا کەوتنی سێ تەلاٌقەی بەسەرا چەسپاند لەگەڵ بەرپەرچدانەوەکەی یان نا ؟)[٢] .

**٧- فەرمـوودەکەی فاتیمەی کـچی قـەیس هـیچ سـەنەدێکی نـی یـە :** چـونکە بەسـەرا بڕینەکـەی بەیـەك دەربڕین (لفظ) نیە ، بـەڵکو لێـك جیـاواز دانـراوە بەهەرشـێوەی گونجـاو بوبێـت، وە ئـەو پرسـیارەش کـە لەپێغەمـبەر(صلی الله علیه و سلم ) کراوە لەمیانەی باسی نەفەقەو دابینکردنـی شـوێن بـوە دوای تـەلاٌقی

---

٤ بەشەرحی صحیح ی بوخاری ٩/٣٨٧

١ اغاثة اللهفان ١/٣٣٢

٢ فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٩/٣٦٢

سىَ يـەم (نـەوەك تـەلاَقى سىَ بـە سـىَ). پاشـان ئـەم فەرموودەيـە پێـشەوا موسـليم گێڕاويەتيـەوە لـە صەحيحەكەيدا لە ژێر ناونيشانى (المطلقة البائن لا نفقة لها) تەلاَقدراوى تەلاَق كـەوتوو هـيچ نەفەقەيـەكى نى يە.كەنزيكەى بيست گێڕانەوەى پشت بەهێزن . وەهەروەها ئەبووداوديش لە (سنن) ە كەيـدا هێناويـەتى لەژێر ناوى (نفقة المبتوتـة) نزيكـەى دە فـەرمودەى پـشت ئەسـتورى هێنـاوە.ئـيتر جگـە لـە هـەموو ئـەوەى كەهــەردوو پێــشەواكەى فــەرمووده لەشــوێنى جياجيــادا گێڕاويانەتــەوە ، وەئــەوەى كەپێــشەوا بوخــارى گێڕاويەتيەوە بەو سـەنەدە لێـك جياوازانـە وەك كـارى هـەموو جـارى دابەشـى كـردووە بەسـەر دەروازەكـانى فيقهـدا. وەكورتـەى گێڕانـەوەكان لـە صـەحيحى موسـليم و بوخـارى و سـونەنى ئـەبو داودا بـەم شـێوەيەى خوارەوەيە :

أ- ان زوج فاطمة طلقها...فذهبت الى رسول الله( صلى الله عليه و سلم)...

ب- ان زوجها طلقها فبت طلاقها.

ت- ان زوجها طلقها البتة.

ث- ان زوجها طلقها ثلاثاً.

ج- ان زوجها طلقها آخر ثلاث تطليقات.

ح- ان زوجها بعث اليها بتطليقة كانت باقية لها.

لەدەربڕينێكى ڕاستدا هاتووە كە (انه طلقها آخر ثلاث تطليقـات) كەئەمـە سـەنەدێكى ڕاسـتە . ئـيتر ئـەم گێڕانەوەيە ناديارى و پێكە شێلراوى فەرمودەى (طلقها ثلاثاً) ڕوون دەكاتەوە و لێكدنەوەى جوانى بۆ پـێش چاو دەخات،بۆيە بەمە دەگەينە ئەو ئاكامـەى كەفەرمودەكـە ئـەوە ناگەيـەنێت كەهەرسـىَ تەلاَقـەى پێكـەوە بەيەك دەربڕين ى سىَ بە سىَ دابێت[1]

## ٨- گفتوگو لەسەر فتواكەى ئيبن عباس و لێكدانەوەى گێڕانەوەكەى:

چەند تێبينى و گللەييەك دێتە سەر ئەوەى كەدەسـت بيگرێـت بـە فەتواكـەى ئـيبن عـەباس و لێكدانـەوەى گێڕانەوەكەى بەشتێك كە دژايەتى نێوان گێڕانەوەكەو فەتواكە نەهێڵێ گـرنگترينى ئـەو تێبينيانـە ئەمانـەى لاى خوارەن:

### يەكەم : كار بەفتواكەى ئيبن عەباس بكرێت نەك بەگێڕانەوەكەى :

رونمان كردەوە كەجەمـاوەر(الجمهور)كارنـاكـەن بـە داخـوازى ڕووى ديـارى ئـەوەى ئـيبن عبـاس گێڕاويەتيـەوە كەتەلاَقى سىَ بە سىَ تەنها يەك تەلاَقى پىَ دەكـەوت لەسـەردەمى پێغەمبـەر( صـلى الله عليـە و سـلم) و ئەبوبەكر و دوو ساڵى فەرمانڕەوايەتى عومـەر دا ، بـەڵكو كـار بـەو وەلاَمـەى ئـيبن عبـاس دەكـەن كەئـەو

[1] فتح الباري بشرح صحيح البخاري – باسى فاتمەى كچى قەيس ٤٧٧/٩ –٤٧٨

زاد المعاد ٥٩/٤ ، اغاثة اللهفان ٢٢٢/١

اعلام الموقعين ٥١/٣ ، ( الطلاق في الأسلام محدود و مقيد ) م.كمال احمدعون ص٥١

کەسەی خێزانەکەی خۆی تەلاَق داوە سێ بە سێ و پرسیاری لێدەکات ئەویش دەڵێت : (تۆ لە خوا نەترساویت منیش هیچ دەرویەکم پێ شك نایەت بۆت ،سەرپێچی خوات کردووە و خێزانەکەت لێت پچڕاوەو بوەتەوە بێگانە) واتە بەلێك پچڕانی گەورە (بینونە کبری) بەبەڵگەی ووتەکەی (هیچ دەرویەکم و چنگ ناکەوێت بۆت)دەی شوێن کەوتنی ئەو زانایانە بۆ ڕێگەی کارکردن بەفتواکەی نەك گێڕانەوەکەی لەم مەسەلەیەدا دژایەتیەکی تەواو و ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ ئەوەی ڕای زانایانی ئوصولی لەسەر جێگیر بووە کە لە کاتی دژوەستانی فتواو گێڕانەوەی صەحابیدا دەبێت گێڕانەوەکە پێشبخرێت بەسەر فتواکەیدا .

بۆ نمونە : ئیبن و عەبباس دەگێڕێتەوە لەفەرمودەی (بورەیرە) دا کە فروشتنی کەنیزەك تەلاَقی نیە ، پاشان فتوای داوە بەوەی کەهەر فرۆشتنەکەی تەلاَقدانیەتی ، دەی زانایان گێڕانەوەکەیان وەرگرتووە نەك فتواکەی[1]. هەرچوار پێشەواکە و جگە لەوانیش هەوالّدانەکەی خاتو عایشەیان وەرگرتووە سەبارەت بەحەرامی شیری نێرە[2] لەکاتێکدا کەهەوالّی بڕوا پێکراویش هەیە کەخۆی پێچەوانەی ئەوە فتوای داوە ئەویش ئەوەیە سەردانی خاتوو عایشەی کردووە کەسێك کە خوشکەزاکانی شیریان پێداوە نەك براژنەکانی[3]

ئیبن حەجەر دەڵێت : (خولع بەفتوای ئیبن عباس هەڵوەشاندنەوەیە (فسخ)ە ، بەلاَم بەگێڕانەوەکەی تەلاَقە ، وەصەحابەش هەرکاتێك فەتوای بەپێچەوانەی گێڕانەوەکەیدا ئەوە گێڕانەوەکەی وەردەگیرێت نەك ئەوەی ئەو پێ ی وایە (فتواکەی)[4] و ئەبو هورەیرە کەفەرمودەی (حەوت جار)[5] لەدەمتێخستنی سەگ دەگێڕێتەوە خۆی بەپێچەوانەی فەرمودەکەوە فتوای داوە،دەی زانایان گێڕانەوەکە وەردەگرن و حسێب بۆ فتواکەی ناکەن.[6]

## دووەم / گفتوگۆ لەسەر ئیددیعای نەسخ :

ئەو قسەیەی کە فەرمودەی (کان الطلاق الثلاث واحدة)کاریان بە داواکاریەکەی کردوە لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) و ئەبوبەکر و دووساڵ لەفەرمانڕەوایەتی عومەر دا (خوایان لێ ڕازی بێت) ، پاشان نەسخ بوەتەوە : قسەیەکی وەرنەگیراوە لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە :

١- ئەو یاسا گشتییەی کەزانایانی ئوممەتی ئیسلامی لەسەری یەك دەنگن ئەوە یە کە هیچ دەقێك چ لەقورئان بێت چ لەسوننەنەنسخ نابێتەوە مەگەر بەدەقێکی تر، وەسەردەمی هەموارکردن (تعدیل)ی

---

١ زاد المعاد ٤/٦٠ ، اعلام الموقعین (٥١/٣)

٢ واتە ئەوپیاوە مێردی ئافرەتە شیر دەرەکەیە، وەشیردانە پاڵی ئەو مجازی یە لەبەر ئەوەی ئەو هۆی شیرەکەیە .

٣ فتح الباری شرح صحیح البخاری (١٥٠/٩)

٤ اعلام الموقعین (٥١/٣)

٥ لەئەبوهریرەوە پێغەمبەر فەرمویەتی: پاك بونەوەی دەفرتان ئەگەر سەگ دەمیتێخستبێ ئەوەیە حەوت جار بیشۆی یەکەمیان بە گڵ بێت ، مسلم ئەم فەموودەیەی دەرکردووە ، (سبل السلام ١/٢٨)

٦ اعلام الموقعین سەرچاوەی پێشوو.

دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامی و حوکمە شەرعیەکان بە کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم )کۆتایی پێهاتووە.

٢- عومەری کوڕی خەتتاب هیچ دەقێکی نەسخ نەکردوەتەوە، دووربێ لەو کەسوننەتێکی سەلماو تەنها بە ڕای خۆی نەسخ بکاتەوە،ئەگەر شتی وای بکردایە هاوەڵان (خوای لێڕازی بێت)دەستبەجێ پەرپەرچیان دەدایەوە.

٣- ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەردا( (صلى الله عليه و سلم ))نەسخ بووەتەوە، ئیتر چۆن دروستە گێڕەرەوە (راوی) (ئیبن عەبباس) باسی ئەوە بکات کەلەسەردەمی ئەبوبەکرو بەشێك لەسەردەمی عومەریشدا کاری پێکراوە؟

٤- ئەگەر بووترێ نەسخ بووەتەوە بە کۆڕا (الأجماع) ی هاوەڵان، ئەوە قەبوڵە ئەگەر کۆڕالەسەر چەسپاندنی دەقە نەسخکەرەوەکە هەبێت ، بەڵام ئەو کۆڕایە لەکوێ یە ؟ ئەو دەقە کامەیە ؟. سەبارەت بەوەش هەر خۆیان نەسخیان کردبێتەوە ئەوە ئیتر پەنا بەخوا چونکە ئەوە کۆڕا(الأجماع) یە لەسەر هەڵە کە ئەوان پارێزراوو دوورن لەوە.

٥- ئەگەر بووترێ لەوانەیە نەسخکەرەوەکە لەسەردەمی عومەردا وە دەرکەوتبێ(واتە پێشتر نهێنی بوبێت) چونکە ئەوە دان نانە بەوەدا کە هاوەڵان (خوای لێڕازی بێت)کۆڕابوون لەسەر هەڵە لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەبوبەکر و بەشێکی عومەردا، چۆن دەبێت هەریەکە لە نەسخ کەرەوە و نەسخ کراوە شاراوەبن لەئومەتی ئیسلامیدا بەدرێژایی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم )و ئەبوبەکرو بەشێك لەفەرمان ڕەوایەتی عومەردا ؟ ،بەتایبەتی لەمەسەلەیەکی وا گرنگ و مەترسیداردا کەپەیوەندی ڕاستەوخۆی بە حەلاڵی و حەرامی ناموسی خەڵکەوە هەبێت .

٦- ووتەی نەسخ بونەوەی فەرمودەکە دژایەتیەکی تەواوی هەیە لەگەڵ فەرمودەکەی پێشەوا عومەردا کە دەڵێت : (ان الناس قد استعجلوا في شئ كانت لهم فيه أناة) واتە : خەڵکی پەلەیان بوو لەشتێکدا کەدەبوو تیایدا هێواش و لەسەر خۆبن (سێ تەلاقیان بەیەکەوە دەخست کەدەبوو یەك یەك تەلاقیان بخستایە).( وەرگێڕ)

ئایا ئومەتی ئیسلامی بۆی هەیە لەسەرخۆ و هێواش بێت لە حوکمێکدا کەنسخ کرابێتەوە. سەرەڕای ئەمەش ڕواڵەتی فەرمودەکە ئەوە دەگەیەنێت کەگۆڕا نکاری لەبڕیارەکەدا لە عومەر خۆیەوە بوە ئەویش وەك تۆڵە سەندنێکی تەمبێکەر بۆ ئەو کەسەی کەپەلەیەتی لەشتێکدا کەخوا هێواش جولانەوەی تێدا بڕیار داوە . وەفەرمانیدا پێوەی پابەندبن. (بۆ زیادە ئاگاداری (سەیری فتح الباري) (٩/٣٦٤) بکرێت).

**سێیەم : گفتوگۆ لەسەر لێکدانەوەی (كان الثلاث واحدة) سێ بەیەك بوو.**

لێکدانەوەی فەرمودەی ئەو کات تەلاق سیانی بەیەك حسێب دەکرا : بەوەی ئەوان سێ بە سێ یان بەکارنەدەهێنا لەسەردەمی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه و سلم) و ئەبوبەکر و دووساڵی خەلافەتی

عومەرداو تەنها دەستەواژەی (سێ تەلاقەت کەوتبێ) لەسەردەمی عومەردا داهێنرا، ئیتر ئەویش کردنی بەقسەی خۆیانەوەو لەسەری حسێب کردن،لێکدانەوەیەکی زۆر دورە ئەویش لە ڕاستیەوە لەچەند ڕویەکەوە لەوانە :

**١- ڕواڵەتی فەرمودەکە پشتی تێدەکات ،ئەمە لەلایەکێکی ترەوە یەکێك لەمەرجەکانی لێکدانەوە (تأویل) ئەوە یە کەدەقەکە ئەو جۆرە لێکدانەوەیە هەڵبگرێت.**

**٢- فەرمودەکە بەچەند شێوەی تر گێڕراوەتەوە کەهەمویان پێچەوانە دەوەستنەوە لەگەڵ ئەم لێکدانەوەیەدا لەوانە :**

أ- گێڕانەوەکەی موسلیم و جگە لەویش لە تاووسەوە کە (ابوصهباء) بە ئیبنو عەبباسی ووت : ئایا دەزانیت سێ تەلاق بە یەکێك دادەنرا لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم ) و ئەبوبەکر و سیان لەسەردەمی میرنشینی عومەردا؟ لەوەلامدا ئیبنو عبباس ووتی : بەڵێ[1] دەڵێ دەستەواژەی (بەیەك تەلاق دانراوە) پێچەوانەی ئەم لێکدانەوەیەیە .

ب- لەڕێگەی معمرو ئیبن و جورەیجەوە لە ئیبنو طاووسەوەووە ئەویش لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبو صهباء ووتی بەئیبنو عەبباس : ئایا نازانی کەسێ تەلاقە بەیەك تەلاق حسێب دەکرا لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکر و سەرەتای خەلافەتی عومەردا و دەگێڕرایەوە بۆ یەك تەلاق ؟ ووتی: با[2] .

دەی ڕستەی (دەگێڕرایەوە بۆ یەك تەلاق) دووبارە ناگونجێت لەگەڵ لێکدانەوەی باسکراودا.

٣- لەگەڵ ئەو گریمانەیەشدا کەبابڵێین فەرمودەکە ئەو لێکدانەوەیەش هەڵدەگرێت ، خۆ ئەوە دەخوازێت مافی دەسەلاتی یاسادانان بدرێتە پێشەوا عومەر (خوای لێڕازی بێت)بۆحوکمێك کەپێچەوانەیە بەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمانیان پێ کردوە ، لەو ڕووەوەکە ئەوە قایل بونە بەداهێنانی لەفزی (سێ بە سێ) یەك کەبەبیدعەیەکی خراپ دادەنرێت کەدژە بەوەی لەقورئان و فەرمودەدا چەسپاوە لەدابەشکردنی تەلاق بەسەرجاردا نەك دابەشکردنی بەسەر ژمارەدا .دەی چۆن دانانی حوکمێکی لەو جۆرە دەدرێتە پاڵ پێشەوا عومەر(خوای لێڕازی بێت)؟ بەڵێ پێشەوا عومەر هەستاوە بەتایبەت کردن و مەرجدارکردنی دەقەکان لەبەر بەرژەوەندی گشتی و دەزگای کارگێڕی دادگایی و سەربازی بونیادنا، وەك دیوانەکان بۆ بەرژەوەندی گشتی ... بەلام ئایا چ بەرژەوەند یەك لەڕوخانی کۆشکی خێزانداهەیە بەیەك سات کەچەند ساڵی خایاندوە تا پێکەوە نراوە ؟ وەچ بەرژەوند یەك لەوێرانکردنێکدا هەیە کەسەر بۆ لێکهەڵوەشانی خێزان و سەرگەردان بونی منالان دەکێشێت ؟

---

(١) مجموع فتاوى ئیبن تیمیه ١٣/٣٣

(٢) زاد المعاد ٤/٥٤

٤- ئەو زانایانەی دەڵێن : تەلاَقی سێ بە سێ بەیەکجار دەکەوێت پشت بە چەند فەرمودەیەك دەبەستن کەبەکارهێنانی تەلاَقی سێ بە سێ لەسەردەمی پەیامی خوادا پشت ڕاست دەکەنەوە .

٥-لێکدانەوە بەوەی کە خەڵکی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ )یەك تەلاَقیان دەخست و لەسەردەمی عومەردا دەستیانکرد بە بەکارهێنانی سێ بە سێ ئائەمە لەخانەی مەتەڵ و لادان دا هەژمار دەکرێت وەك ئیبنولقەییم دەڵێت نەك لەخانەی ڕونکردنەوەی مەبەستدا.

چوارەم : گفتوگۆ لەسەر دەنگۆی (فەرمودەکە تایبەتە بەحاڵەتی دووبارەکردنەوەی لەفزەکە): پێشتر باسمانکرد کەهەندێك لەکەسانەی فتوایان بەکەوتنی هەرسێ تەلاَقە بەیەکجار داوە ، وای بۆی چوون کە فەرمودەکەی ئیبنو عەبباس بە تایبەتی بۆ بڕیاری حاڵەتی دووبارە بونەوەی صیغەی تەلاَقەکە لەلایەن مێردەکەوە هاتوەکە مێردەکە وتبێتی : (تەلاَقت کەوتبێ ، تەلاَقت کەوتبێ ، تەلاَقت کەوتبێ ) وە ئەوکات پیاوەکە ئەگەر بیوتایە مەبەستم لەدووەم و سێیەم جەخت کردنەوە بوە لە یەکەم بڕوای پێ دەکرا ، چونکە لەو سەردەمەدا خەڵك دەرونی پاکو ناخی ساغ بوو ، بەڵاَم کاتێ دەروونەکان گۆڕان و متمانە نەما لەسەردەمی عومەردا، عومەر بڕیاریدا ئەو قسەیە لەکەس وەرنەگیرێت و دووەم و سێیەمیش بەتەلاَقی سەربەخۆ حسێب بکرێت نەك بەتەئکیدکرنەوە بۆ یەکەم . ئەم لێکدانەیە لاوازترە لەولێکدانەوانەی تر کەباسمان کردن لەبەر :

١- ڕەوەند (سیاق)ی فەرمودەکە لەسەرەتایەوە هەتا کۆتای ئەوەی قبوڵ نیە وەك لەبەرچاوە.

٢- قبوڵ کردن و قبوڵ نەکردنی مەبەستی تەئکیدکردنەوە بڕیارێکی کارپێکراوە هەرلەسەرتای هاتنی ئیسلامەوە تا بەئەمڕۆ بەبێ جیاوازی لە نێوان پیاوێك و پیاوێکی تردا وەبەبێ جیاکردنەوەی پیاوچاك لە پیاوخراپ ، و ڕاستگۆ و درۆزن ، وەبەبێ تایبەتکردنی بەکات یان شوێنێکی دیاری کراوەوە ، بەشێوەیەك ڕا هاتوەتە سەرئەوە بەلای کەم لە ڕووی دینی یەوە و بۆ قیامەت ئەم قسەیە وەردەگیرێت لە هەرکەسێك بڵێ مەبەستم پێ ی تەئکید بوە لەسەر تەلاَقی یەکەم ، ئەگەر لەڕووی قەزاوەتیشەوە لێ ی وەرنەگیرێت ،کاتێك بەڵاَم بەڵگەیەك نیشانەیەك دژی دەعوای پیاوەکە نەبێت ، ئەو کاتە لەقەزاوەت و بۆ دونیاش لێ ی وەردەگیرێت .

٣- هەرکەسێك بەشێوەیەکی ووتبێت ، ئەگەری تەئکید هەڵبگرێت وەك (تەلاَقت کەوتبێ ، تەلاَقت کەوتبێ ، تەلاَقت کەوتبێ) وەبڵێ مەبەستم تەئکید بوە ئەوە لێ ی وەردەگیرێت لەهەر سەردەمێکدا بێت ، چ جای سەردەمی خولەفای ڕاشیدین کەلە باشترینی سەردەمەکانە ، ئەگەر پیاوەکە بەدەستەواژەیەك تەلاَقەکەی ووتبێ ئەگەری تەئکیدکردنەوە هەڵنەگرێت وەك ئەوەی ووتبێتی (هەرسێ تەلاَقەت کەوتبێ) بڕوای پێ ناکرێ بێ گوێدانە ڕاددەی متمانە و ڕاستی دەعواکەی [1]

---

[1] بۆ زیاتر ئاگاداری (سەیری نیل الاوطار ٦/٢٦٢) ، (زاد المعاد ٤/١٦) بکرێ

پێنجەم : سەبارەت بە بەرگری لەتانەدان لەگێڕانەوەکەی ئیبن عەبباس ، بەیهەقی چەند ڕیوایەتێکی لە ئیبن عەبباسەوە هێناوە کە سێ تەلاقەی بەیەك دەربڕین تێدایە ، پاشان لە ئیبنولمونزیرەوە دەگوێزێتەوە کەگومانی وانیە ئیبنو عەبباس شت لەپێغەمبەر (ﷺ)ببیستێت و فتوا بەپێچەوانەکەی بدات . ئیتر سەرەنجام دێتە سەر هەڵسەنگاندن و دەستنیشان کردنی پەسەندترینڕا لە نێوان دەستگرتن بەڕای زۆرینە و ووتەی تاکە کەس کە لەپێشترینیان زۆرینەکەیە ئەگەر ئەو کەسە قسەکەی پێچەوانەی زۆرینە بێت.

ئیبنولعەرەبی دەڵێت : ئەم فەرموودەیە ناکۆکی لەسەر ڕاستیەتی هەیە ، ئیتر چۆن پێش دەخرێت بە سەر کۆڕا (إجماع) دا ؟ وەدەڵێت : فەرموودەکەی مەحمودی کوڕی لوبەید دژی دەوەستێتەوە چونکە ئەوەی بەڕاشکاوی تێدایە  کە ئەگەر کەسێك سێ تەلاقەی بەیەکەوە بخستایە پێغەمبەر (ﷺ)لێ نەدەگەڕا بەڵکو بەسەری دا جێبەجێی دەکرد .

- دەشڵێن موسلم هەرخۆی گێڕاویەتیەوە ... تاکۆتایی ئەوەی کەووتراوە و دەیڵێن لە ئاڕاستەکردنی تانە بۆ گێڕانەوەکەی ئیبنو عەبباس هەتا ئەوە ببێتە هۆکاری کارکردن بەفتواکەی .

ڕاستیەکەی ئەوەیە کەگێڕانەوەکەی ئیبنو عەبباس ناوبانگی دەرکردوە بەفەرموودەیەکی ڕاست و دروست حسێبی بۆ دەکرێت لای گەورە زانایانی فەرموودە لەنمونەی پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

وەبەڕاستی هەریەك لە ئیبنو تەیمیە و ئیبنولقەییم گفتوگۆیان لەسەر ئەوە کردوە کەهەندێ لە زانایان دەستیان پێوە گرتووە بۆ کەم کردنەوەی بەهای گێڕانەوەکەی ئیبنو عەبباس و مۆڵەت دان بۆ کارکردن بەفتواکەی .

ئیبنو تەیمیە(ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت [1]: (پێ نازانین کەسێك تەلاقی خێزانەکەی لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)بەسێ بە سێ دابێت پێغەمبەر (ﷺ)هەرسێکەی بەسەردا چەسپاندبێت و خستبێتی ، یەك فەرموودەی نەصەحیح و نەحەسەن لەو بارەوە نەگێڕڕاوەتەوە ، وە هیچ کەس لە خاوەنی کتێبە متمانە پێکراوەکان شتێکی وایان نەگواستوەتەوە ، بەڵکو هەموو ئەوەی لەو بارەوە گێڕراوەتەوە فەرموودەی لاوازن بەیەك دەنگی زانایانی فەرموودە نەك لاواز بەڵکو هەڵبەستراویشن . وەئەوەش لەصەحیحی مسلم و غەیری ئەویشدا لەسوننەن و مەسانید دا هاتووە هەر ئەوەیە کە تاووس لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕڕاویەتەوە کە ووتویەتی : (تەلاق لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئەبوبەکرو دوو ساڵی فەرمانڕەوایەتی عومەردا سێ تەلاقە یەك تەلاقی پێدەخرا ) دواتر عومەر ووتی : خەڵکی پەلەیان کردووە لەشتێکدا کەبۆیان هەبوو دەستی پێوە بگرن و پەلەی  تێدا نەکەن (واتە هەرسیانی پێکەوە نەخەن) ئیتر بەسەریاندا هەرسیانی چەسپاند، وەلەگێڕانەوەی موسلیم و غەیری ئەویشدا هاتووە لە طاووس وە : کەئەبو صەهباء بەئیبنو

[1] مجموع الفتاوی ابن تیمیه ٣٣/١٢-١٣

عەبباسی ووتوە : ئایا دەزانی سیان بەیەکێك دادەنرا لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکرو سێ لەفەرمان ڕەوایەتی عومەردا ؟ ئەویش ووتویەتی : بەڵێ .
لەگێڕانەوەیەکی تردا : ئەبو صەهباو بەئیبنو عەبباسی ووتوە بێنە ئەوەی لاتە ئایا تەلاقی سێ بە سێ لەسەردەمی پێغەمبەر دا (ﷺ )و ئەبوبەکر یەك تەلاق نەبوو؟ ووتی : بەڵێ وا بوو
بەلاّم کاتێ لەسەردەمی عومەردا (خوای لێرازی بێت)تەلاقیان بە شوێن یەکدا دەهێنا بڕیاری جێبەجێکردنی دا لەسەریان).
- ئیبنو لقەییم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت : کەڕووی دەمی لەو زانایانە یەکە تانە دەدەن لەگێڕانەوەکەی ئیبنو عەبباس و کاربەفتواکەی دەکەن دەڵێت : (ئێوە و هەرکەسی تریش کە ئەوە دەڵێن ئایا بەرامبەر بەهەموو فەرمودەیەك کەتەنها موسلیم گێڕاویەتیەوە و بوخاری لەگەڵ نەبێت هەروا دەڵێن یان ئەم قسەتایبەتە بەم فەرموودە؟
وە ئایا پێشەوا بوخاری خۆی هەرگیز ووتویەتی هەرفەرمودەیەك من لە صەحیحەکەمدا دامنەنابێت ئەوە ناڕاست و بەتاڵە و ناکرێتە بەڵگەو لاوازە ؟ بوخاری و چەند فەرموودەی دەرەوەی صەحیحەکەی خۆی کردوەتە بەڵگە و باسی صەحیحیشی نەکردوە ؟ وەچەند دانی ناوە بەدروستی صحەتی فەرموودەیەنکدا کەلەدەرەوەی صەحیحەکەی بووە ؟
پاشان دەڵێت : وەپرسیارتان لێ دەکەم ئەرێ وەرگرتنی ئەوەی صەحابی گێڕاویەتیەوە لای ئێوەقەبوڵە یان ئەوەی ئەو پێی وایە واتە ( فتواکەی) ؟ ئەگەر وتتان : گێڕانەوەکەی کە قسەی جمهورەکەشتانە بەڵکو جمهوری ئوممەت وادەڵێت لەسەر ئەمە ئەم وەلاّمانە بەسە ، وە ئەگەر ووتتان ئەوەی ئێمە لامان لەپێشترە کارکردنە بەفتواکەی ، دەی خۆ قسە دژبەیەکەکانتانمان خستە پێش چاو بەشێوەیەك کە هیچ فێڵێك نەمێنێت بۆبەرگریکردن بەتایبەتی لەخودی
ئیبن عەبباس .. تاکۆتاییە . (بۆ زیاتر ئاگاداری سەر لە (زاد المعادی) ئیبنو لقیم بدرێ ٤/٦٠-٦١)

**گفتوگۆی بەبەڵگەکردنی ئیجماع :**

- ئید دیعای ئیجماع نەسەلماوە بەڵکو دژە بەواقیع و ڕاستیەکان چونکە چەند بەڵگەی زۆر و گێڕانەوەی بە ناوبانگ هەن ئەوە دەسەلێنن کە ئیجماع لەهیچ سەردەمێك لەسەردەمەکاندا نەهاتوەتەدی لەسەر ڕاستیەتی کەوتنی هەرسێ تەلاقە بەیەك دەربڕین لەسەرەتای سەر هەڵدانی ئیسلامەوە تا بەئەمڕۆ .
- ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) (فتح الباری شرح الصحیح البخاری ٩/٢٦٢) لەڕاڤەکردنی ووتەی بوخاریدا (باب من جوز الطلاق الثلاث ) دا دەڵێت : (لەوەرەگێڕانەکەیدا ئاماژەی ئەوە هەیە لە پێشیاندا خەڵکێك هەیە کەماوەی کەوتنی تەلاقی سێ بە سێ نادات ) .

- له ڕاڤـەکردنی فـەرمودەی ڕەکانـە دا (ڕەکانـەی کـوڕی عەبدیەزیـد هەرسـێ تەلاّقـەی خێزانـی دا لەیـەك مەجلیسدا دواتر زۆر بۆی بێتاقەت بوو خەفـەتی بـۆ خـوارد ، پێغەمبـەر (ﷺ)پرسـیاری لێکـرد : (چۆنت تەلاّقدا ؟) ووتی : سێ تەلاّقە لەیەك مەجلیسدا ، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی : (دەئـەوە یـەك تەلاّقـە ئەگـەر ئارەزووت لێ یە بیگێڕەوە ئەویش گێڕایەوە ژێر نیکاحی خۆی) ).

عەسقەلانی دەڵێت : (گوێزراوەتەوە لە عـەلی و ئـیبن مـسعود و عەبـدوڕڕەحمانی کـوڕی عـەوف و زوبـەیر و هاوێنـەی ئـەو . ئـەوە ئیبنـو موغیـث لەکتێبەکەیـدا (کتـاب الوثـائق) گواسـتویەتیەوە وەداویەتیـە پـاڵ موحەمـەدی کـوڕی وەضـاح . وە غەنـەوی ئـەوە دەگوێزێتـەوە لەکۆمـەڵێك لـە مۆسـتایانی قورتبـە وەك موحەمەدی کوڕی تەقی کوڕی موخەللەدو موحەممەدی کوڕی عەبدوسسەلامی خەشەنی و غەیری ئەمانیش وە ئیبنولمونزیر دەیگوێزێتەوە لـە یـارانی ئیبنوعەباسـەوە وەك عـەتاو تـاوس و عـەمری کـوری دینـار ، وە جێگای سەرسورمانە کە ئیبنوتین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بە پێویست گەڕانی کەوتنی سێ‌بە سێ کێشەیەکی لەسەر نیە ، بەڵکو ئەوەی جێگای ناکۆکی نێوان زانایانە حەرام بونیەتی(واتە دروسـت نیـە سـێ تەلاّق بەسەر یەکەوە بخرێت) ،لەکاتێکدا بەپێچەوانەی ئیبنو تینەوە سملاوە وەك دەبینی)[1]

* پێشەوا عەینی لەڕاڤەی (باب من أجاز الطلاق الثلاث) دا دەڵێـت: واتـە ئەمـە دەروازەیەکـە بـۆ ڕون کردنەوەی ئەو کەسەی مۆڵەت دەدات ئافرەت بەیەك جار هەرسێ تەلاّقە بدرێ ..

وە بوخاری ناوو نیشانێکی بۆئەم وەرگێڕانە داناوە کە ئاماژەی ئـەوەی تێدایـە لەپێـشیناندا کەسـی وا هەیـە مۆڵەتی کەوتنی تەلاّقی سێ‌بەسێ نادات و ناکۆکیـشی تێدایـە : تـاووس و موحەممـەدی کـوڕی ئیـسحاق و حەجاجی کوڕی ئەرئەت و نەخەعی و ئیبنو موقاتیل و زاهیریەکان وای بۆچوون ئەگەر پیـاو سـێ تەلاّقـەی خێزانی دا پێکەوە ئەوە تەنها یەك تەلاّقی کەوتووە .

* وەبەڵگەش بۆ ئەوە بەوە دەهێننەوە کە موسلیم گێڕاویەتەوە لە فەرموودەکەی تاووس دا کە ئـەبو صـەهبا ووتوییەتی بە ئیبنو عەباس : ئایا دەزانیـت کـاتی خـۆی لەسـەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ) و ئەبوبـەکرو سـیان لەفەرمـان ڕەوایەتی عومـەردا سێ تەلاّق بەیەك دادەنرا؟ ئیبنو عـباس یش ووتویەتی : (بەڵێ)[2]

* ئیبنو تەیمیە دەڵێت : (ئەم قسەیە — واتە ئەوەی کە تەلاّقی سێ بەسـێ یـەك تـەلاّق بێـت —گوێزراوەتـەوە لەکۆمـەڵێك لـە پێـشینان و پاشـینانەوە لـەهاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) وەك زوبـەیری کـوڕی عـەوام و عبدوڕەحمانی کورعـەوف، وە دەگێڕرێتـەوە لـە علـی و ئیبنومەسـعود و ئیبنـو عـەباس کەئـەو دوو قـسەی لێدەگێڕنەوە )[3] .

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ( ٩/٢٦٣ )

٢ ( عمده القاری شرح صحیح البخاری) عینی ( ٢٠/٢٣٣)

٣ مجموع الفتاوی ئیبن تیمیه ( ٣٣/٠٨)

* وە ئیبنو تەیمیە دەڵێت : (ئوممەت کۆنەبونەتەوە – سوپاس بۆ خوا - لەسەر دژایەتی ئەم قسەیە – واتە دژایەتی ئەوەی کەلەسەر دەمی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکردا تـەلاقی سـێ بەسـێ یـەکێکی پێکـەوتبێت – بەڵکو لە ئوممەت دا کەسانێك هەن بێ برانەوە چەرخ دوای چەرخ فەتوای پێدەدەن .

ئەمڕۆشەوە ، دەریای زانستی ئومـەت و وەرگێـڕی قورئـان (عەبـدوڵای کـوڕی عـەباس)فتـوای پێـداوە ، وە زوبەیری کوڕی عەوام و عبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ئیبنو وةضـاح لێیـان دەگێڕێتـەوە کـە فتوایـان داوە سێ بەسێ تەنها یەك تەلاقی پێدەکەوێت، وە لـە علـی و ئیبنومەسعودەوە دوو گێڕانـەوە هەیـە ، وەك لـە ئیبن عەباسەوە وابوو)

بەپشت بەستن بەم سەرچاوە بڕواپێکراوانە و غەیری ئەمـانیش بۆمـان دەرکەوت کە ئیددیعای ئیجماع لەسـەر ڕەوایی کەوتنی هەرسێ تەلاقە بەیەك دەربڕین پوچەڵو بێ ناوەڕۆکە و هیچ بنەمایەکی نیـە ، وە ئـەوە تـەنها لێتێکچون و تێکەڵ کردنە لەنێوان کۆکبون و یـەك دەنگـی گـەورە موجتەهیـدانی ئومـەت و یـەك دەنگـی زانایانی مەزهەبێکدا . ئای کە لێك دورن ئەو دوو جۆرە ئیجماعە .

## گفتو گۆی بەڵگە هێنانەوە بەبەراگرتن (القیاس):

* خاوەنی ئەو ڕایەی کە دەڵێت تەلاقی سێ بەسێ بەیەکجار هەرسیانی دەکەوێت بەڵگـە دەهێننـەوە بـەوەی کە نیکاح موڵکی مێردە بۆی هەیە تەنازولی لێ بکات بەیەك دەربڕین بە قیاسی ئەوەی کەدروستە تـەنازول لەسەر هەرمافێکی تری بکات . هەروەها دەڵێت : بە قیاس لەسەر ئـازاد کـردن (الإعتـاق) و نـەزر کـردن وەك لەپێشەوە باسمان کرد .( اعلام الموقعين (٣/٤٨)

ئێمە پێمان وایە قیاس کردن لەتەواوی ئەم شێوانەدا پوچەڵ و باتڵە لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە:

## یەکەم : قیاس کردنە سەر دەست هەڵگرتن لەهەر مافێکی تر :

قیاسێکی فاسیدە ، چونکە مرۆڤ ئازاد نییە لە دەست هەڵگرتن لە هەموو ئەو مـافانەی کە هەیەتی، چونکە هەندێکیان پەیوەستن بە بەرژەوەندی خەڵکی ترەوە، وەلە دەست هـەڵگرتن لەوجۆرەمـافانـە زیـان بـەو کەسـانە دەگـات . وەك (دایـەنی) کـە دروسـت نیـە ئـەو مافـەی نـەوێت و دەسـتی لێهـەڵبگرێت، تامـافی منداڵەکە نەفەوتێت . وە مـافی هەرکەسـێك کۆتـایی دێـت لـەو جێگەیـەی کـە مـافی کەسـانی تـر دەسـت پێدەکات، کەواتە پیاو بۆی نیە کەی و چۆنی ویست تـەلاق بـدات چـونکە لـە تەلاقدانەکەیـدا شـوێنکارێك پەیدادەبێت کەپەیوەندی ڕاستەوخۆی بە خێزان و منداڵکانییەوە هەیە و هەندێ جـاریش ئاکامـە خراپـەکانی قەتیس نابن لە چوار چێوەی خێزاندا بەتەنها بەڵکو سەر دەکێشن بۆکۆمەڵگا.

وەئاینی بەرزی ئیسلامیش هەر لەسەرەتای لە دایك بوونیەوە بڕیاری داوە کە :

مـافەکان ئەرکی کۆمـەڵایەتین ئیتر خاوەن مـاف بۆی نیە بە ئارەزووی خۆی تیایدا هەڵسوڕێ . وە پاش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە دەیەها سەدە یاساناسان پەی یان برد بە گەورەیی و گرنگی ئـەم بیرۆکەیـە،و یەکـەم

کەسێك کە ئەم بیرۆکەیەی ڕاگەیاند زانایەکی فەڕەنسی بوو بەناوی دیکی (duquit) لەبابەتێکدا ڕایگەیاند : کە مولکیەت ماف نیە بەلکو ئەرکێکی کۆمەلا یەتیە .

**دووەم : بە بەرابرین (القیاس) ی تەلاق لەسەر ئازاد کردن (الإعتاق).**

قیاس کردنە لەگەڵ جیاوازیدا چونکە ئازاد کردن سودی تاك و کۆمەلگە و ئوممەتی تێدایە. هەر لەبەر ئەمەشە ئیسلام خەلکی بۆهەلدەنێت و ڕێگای جۆراو جۆری بۆ دەگرێتەبەر بۆ کۆتایی هێنان بە دیاردەی بە کۆیلە کردنی مرۆڤ بۆ برا مرۆڤەکەی کە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ئەو بنەما یەکسانیەی کە قورئانی پیرۆز بانگەشەی بۆ دەکات لەو فەرموودەیەی خوای گەورەدا کە دەفەرمووێت : (**يا أيها الناس انا خلقناكم من ذكرٍ و أنثى و جعلناكم شعوباً وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عندالله أتقاكم**)سورة الحجرات ١٣/ لەکاتێکدا کەم ڕێك دەکەوێت تەلاق دان خالی بێت لەتێکدان یان زیان گەیاندن بەژن و مێردەکە یان بە یەکێکیان یان بە منداڵەکان .

**سێیەم : قیاس کردنی بە نەزرەوە :**

ئەمیش کەمتر دوور و نە گونجاو نیە لە دوو قیاسکردنە کەی پێشوو . چونکە نەزرکردن پەرستشی تێدایە ، درووستە مرۆڤ خۆی پابەند بکات پێوەی بەهیوای نزیك بونەوە لەخودای پەروەردگار ، وەك ئەوەی کەسێك بڵێت : بۆ خوا نەزر بێت لەسەرم کە ئەوەندە ببەخشم ، یان ئەوەندە بەرۆژووبم ، بەپێچەوانەی تەلاقەوە کە سەر پێچیە لە فەرمانی خودا بێزراوترین حەلاڵە لای خودا ئەگەر بۆ پێویستیەکی زۆر پێویست نەبێت ، جا ئەگەر هاتوو بۆ پێویستیش بوو ئەوا یەك تەلاق بەسە چونکە پێویستی بە ئەندازەی قەبارەی پێویستیەکە دیاری دەکرێت .

## باسی چوارەم

## دەستەواژەیەك ژمارەی تێدا بێت تەنها یەك تەلاقی پێ دەكەوێت

هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)و هەندێ لە شوێن كەو تـوان و شـوێن كـەوتوی شـوێن كـەوتوان ئـەم تەووژمـەیان گرتووەتە بەر – وەك لە پێشەوە باس كرا.

وەلەو زانایانەی لە مەزهەبە ئیسلامیەكاندا فتوایان پێداوە : محمدی كوڕی موقاتیل لەحەنەفیەكان و هەندێ لـە مـالیكیـەكان و هەنـدێ لەحەنبەلیـەكان و جـەماوەری جەعفـەری و زەیـدی و زاهیریـەكان .وە زۆرێـك لەزانایانی دواینە دەستیان پێوە گرتووە ، و یاسای باری كەسێتی لەتێكڕای وولاتانی ئیـسلامیدا لەسـەری جێگیر بوەو لەنگەری گرتووە .

• حەنەفیەكان :

* لەكتێبی (إغاثة اللهفان)دا هاتوە : (لەكتێبی (المعلم)دا مازەری گێڕاویەتیەوە لە موحەمـەدی كـوڕی موقاتیل لە هاوەڵانی ئەبوحەنیفە كەئەو لەدیارترین هاوەڵانیانە لە دەسـتەی سـێ یـەم لـە هاوڕێیـانی ئـەبو حەنیفە ، كە ئەوە یەكێكە لە دوو قسەكەی مەزهەبی ئەبوو حنیفە)[1]

* وە لە كتێبی (اعلام الموقعین) دا هاتووە : (فتوایان پێ داوە هەندێك لەحەنەفیەكان كەئەمە ئەبوبـەكری ڕازی لە محمدی كوڕی موقاتیلەوە گێڕاویەتەوە )[2]

* وە لە (أحكام القران)[3] ی جەصاصدا لەتەفسیری ئایـەتی (اطـلاق مرتـان) دا هـاتووە : (بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی كـە مەبەسـت تیایـدا ئەوەیـە فـەرمان دەدات بەجیاكردنـەوەی تـەلاق ، ئەگـەر كەسـێك دوو تـەلاقی بەیەكەوە دا دروست نیە بووترێت دوو جار تەلاقی داوە).

• مـالكییەكان :

* لەكتێبی (اعاثة اللهفان) دا هاتووە[4] : (تەلەسانی لە شەرحی تەفریعدا لە مەزهـەبی پێـشەوا مـالیـك دا لـە مەزهەبەكەیـدا دەگێڕێتـەوە ، بـەڵكو گێڕانەوەیـەك لـە پێـشەوا مـالیكـەوە ، وە غـەیری ئـەویش قـسەی مـەزهـەب دەگێڕنـەوە كـە یـەكێك لـە دوو قـسەكەی مـەزهـەبی پێـشەوا مـالیـك و پێـشەوا ئـەبو حەنیفـە و شەیخولئیسلامیش لە هەندێ لە یارانی پێشەوا ئەحمەدەوە گێڕاویەتەوە كە هەڵبژاردەی خۆشیەتی ).

* وەئەوەش لە ووتەكەی ئیبن ڕووشدی مـالیكی وەردەگیرێت كـە پەسـەندتر لـەلای ئـەم ڕایەیـە وەك دەڵێـت: (پێ دەچێت جمهور بڕیاری قورسیان دابێت لە تەلاق دا لـە بـەر ئـاخنینی هۆكـار (سـداً للذریعـة) ، بـەلام

---

١ اغاثة اللهفان من مصاید الشیطان ٣٠٨/١

٢ اعلام الموقعین ٣٥/٣

٣ احكام القران ی پێشەوا ابو بكری جە ساس ی حەنەفی ٧٣/٢

٤ سەرچاوەی پێشوو ٣٠٨/١

بەتاڵ دەبێتەوە بەو مۆڵەتە شەرعیە ، وە ئەو نەرمی یە خوازراوە لەوێدا مەبەستم فەرموودەی خوایە کە دەفەرموێت : (لعل الله يحدث بعد ذلك أمرا)[1].

**حەنبەلیەکان :**

ئیبن تیمیە دەڵێت : (ئەو تەڵاقەی ژمارەی لەگەڵ دایە حەرامە و تەنها تەڵاقی پێ لازم دەگەڕێ، وە ئەم قسەیەش لە پێشینەو پاشینەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە گوێزراوەتەوە وەك : زوبەیری کوڕی عەوام و عەبدوڕ ڕەحمانی کوڕی عەوف ، وە لە (علی و ئیبن و مەسعود و ئیبن عباس) یشەوە دوو قسە گێڕراوەتەوە ، و محمدی کوڕی ئیسحاق ، کەئەوەش قسەی زۆرێك لە شوێن کەوتووان(تابعین)و دوای ئەوانیشە وەك طاووس وخەللاسی کوڕی عەمر، وەقسەی داودو زۆربەی هاوەڵانیەتی ، هەرئەوەش لە ئەبو جەعفەری کوڕی محمدی کوڕی علی کوڕی حسەین و کوڕەکەی جەعفەری کوڕی محمد گێڕراوەتەوە ، وەهەر لەبەر ئەمەیشە کە هەرکەس لەگەڵ مەزهەبی شیعەیە ئەمە ڕایەتی ، وە هەر ئەوە ووتەی هەندێك لەیارانی ئەبو حەنیفەو مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە)[2]

• جەعفەریەکان:

لەکتێبی (الخلاف)دا هاتووە[3]: (ئەگەر سێ تەڵاقەی دا بەیەك لەفز ئەوە دایهێناوەو یەك تەڵاقی دەکەوێت ئەگەر مەرجەکانی کەوتنی تەڵاقی تێدابێت لەلای زۆربەی هاوەڵانمان ، وە تیاشیاندایە کە دەڵێت هەر هیچ تەڵاقێکی ناکەوێت . کە (عەلی)[4] بەوە فتوای داوە هەروەها زاهیریەکانیش ، وە **طةحاوی** لە محمدی کوڕی ئیسحاقەوە دەگێڕێتەوە کەووتویەتی یەك تەڵاقی دەکەوێت . وە بەڵگەشمان کۆڕا(اجماع) ی جیابونەوەیە ، وە یاساش وایە کە گرێبەستەکە بەردەوام بێت ).

لە کتێبی (الروضة البهية) داهاتووە: [5](ئەگەر تەڵاق بەزیاتر لە یەك دانە لێکبدرێتەوە وەك ئەوەی ووتبێتی : هەرسێ تەڵاقەت کەوتبێ ،ئەو لێکدانەوەیە وەرناگیرێ و لەغوەو تەنها یەك تەڵاقی پێدەکەوێت لە.......لەوەدا کە تەڵاق دەدات سێ بی سێ لەیەك مەجلیسدا ووتی یەك تەڵاقی دەکەوێت).

※ لەکتێبی (شرائح الاسلام) داهاتووە : (ئەگەر تەڵاق لێك بدرێتەوە بە دووتەڵاق یان سێ ووتراوە ئەوە بەتاڵە).

• زەیدیەکان :

---

[1] (يا ايها النبي اذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن و احصوا العدة واتقوا الله ربكم)(الطلاق/١ بدايةالمجتهد و نهاية المقتصد (٥١/٢ )

٢ مجموع فتاوى ابن تيمية (٨/٣٣ )

٣ (الخلاف في فقه) ی علامة (طوسي) (٢٢٦/٢-٢٢٧ )

[4] واتە بەوەی یەك تەڵاقی بکەوێت

٥ ڕاڤەی (اللمعه الدمشقيه) ١٤٨/٢

* لەکتێبی (لتاج المـذهب)[1] داهاتووە : (دووەم لە بڕیارەکانی تـەلاق ئەوەیـە کـە چـەند تـەلاقێك بەشـوێن یەکدا نەیەن ، ئەگەر تەلاقیدا بەزیاتر لەیەك ئـەوە تـەلاقی دووەم نابێتـە شـوێن کـەوتوی یەکـەم و ناکـەوێت مـەگەر لە پاش یەکەم گێڕابێتیەوە ژێر نیکاحی خۆی ئینجا تەلاقی دووەمی دابێت ، ئەگەر وابێت هـەردوو کیان یەك تەلاقی پێدەکەوێت نەك دوو ، ئیتر وەك یەکە ئەو زیاتر لەیەکە دووان بن یان سیان ، بەیەك لـەفز بوبێت وەك هەرسێ تەلاقەت کەوتبێت ، یان بە چەند لەفزێك بێت وەك (تەلاقت کـەوتبێ تـەلاقت کـەوتبێ تەلاقت کەوتبێ) ئەوە تەنها یەك تەلاقی دەکەوێت ، چونکە تەلاق لای ئێمە شوێنکەوتەی تەلاق نابێـت لـە دوو وێنەدا)

وە بەوێنەی ئـەم تەووژمـە لـەکتێبی (الـدراری المـضيّة)[2] و لـە (البحـر الزخـار)[3] و (المنتـزع المختـار)[4] دا هاتووە .

## ظاهیریە کان :

لـە (اغاثـة اللـهفان)[5] داهـاتووە : (لـەو کەسـانەی کەپێـچەوانەیان ووتـوە داود و هـاوەڵانین کـە ئـەوەیان هەڵبـژاردووە سـێ تەلاقـە یـەك تەلاقـە). وە لـە فتـوای ابـن تیمیـە [6]شـدا هەیـە : (ئـەوە قـسەی داود و هاوەڵانیەتی) وە **ظاهیریەکان** جگە لە (ئیبنوحەزم) لەگەڵ ئەو ڕایەن کە هەر تەلاقیك ژمارەی لەگەڵدا بێت تەنها یەك تەلاقی دەکەوێت .

## بەڵگەی پشتیوانانی ئەم ڕایە :

پشتیوانانی ئەم ڕایەی کەدەڵێت هەر تەلاقێك ژمارەی لەگەڵ دابێت تـەنها یـەك تـەلاقی پێدەکـەوێت چـەند بەڵگەیەکی زۆر دەهێننەوە کەگرنگترینیان بریتیە لە قورئان و سوننەت و قیاس .

## یەکەم قورئانی پیرۆز :

یاسایەکی گشتی لە شەریعەتی ئیسلامدا هەیە کە بریتیە لە : هەر گرێبەسـتێك هـەر دوولا پابەنـد بکـات بەتاك لایەنێك هەڵناوەشێتەوە مەگـەر بـۆ چـەند حاڵـەتێکی ناچـاری وتوشـهاتێکی کتـوپڕ ، وەگرێبەسـتی هاوسەرگیریش لەو گرێبەستانەیە کە ژن و مێـرد پابەنـد دەکـات و مـاف و ئـەرکی بـۆ هـەردوولا بەرامبـەر بەیەك لێ پەیدادەبێت ، ئەصڵ وایە کەمێرد بەویستی یەك لایەنەی خۆی هیچ دەسەلاتێکی هەڵوە شاندنەوەو

---

[1] (التاج المذهب لأحكام المذهب شرح متن الأزهار فى فقه الائمة الاطهار) ی صەنعانی ٢/١٩٩

٢ (شرح الدرر البهيه) ی شەوکانی( ٢/٧١)

٣ (٣/١٧٤) ئەوەشی تێدایە کەتەلاق شوێن تەلاق ناکەوێت مەگەر( ڕیجعەت) یان( عقدی) لەنێوان دابێت

٤ (٦)(٢/٤٥٢)

٥ اغاپە اللهفان سەرچاوەی پێشوو ( ١/٣٠٧)

[6] مجموع الفتاوى ابن تيميه ( ٣٣/٨ )

کۆتایی پێهێنانی ئەم گرێبەستەی نەبێت بەگوێرەی ئەو یاسایەی باسمان کرد ، بەلاّم ئەوەندە هەیە کە خودای پەروردگار لەبەر چەند حیکمەت و بەرژەوەندیەك ئەم دەستەلاّتەی بەهەلاّواردن وەك مۆڵەت بەخشیوەتە مێردبەچەند مەرجێك و لەچوار چێوەیەکی سنورداردا ، لەو مەرجانە کۆتایی هاتنی پەیوەندی ژن و مێردی بە سێ قۆناغ دێت کەلەنێوان هەر قۆناغێکو قۆناغێکی تردا بەشێك لەکات یان ڕیجعەت یان گرێبەستێکی نوێ هەبێت ، وەك هەندێك لە زانایان دەڵێن کە ئەویش بە پشت بەستنە بە فەرموودەی خوای گەورە کە دەفەرمووێت : (الطلاق مرتان فإمساك بمعرف او تسريح بإحسان)ـ البقرة ٢٢٩/

*** ڕووی بەڵگە هێنانەوە :**

ئەوان دەڵێن (مرتان) لەزمانی عەرەبیدا بەڵکو لەتەواوی زمانەکانی خەڵکیدا تەنها کاتێك دەبێت کە جار(**مرة**) یَك لەدوای (**مرة**) یەك بێت ، و لە زاراوەی قورئانی پیرۆزیشدا لەفزی (**مرة**) نەهاتووە تەنها بۆ ئەم واتایە نەبێت وەك لە فەرموودەی خوای پەروەردگاردا هاتووە کە ئە فەرموێ :

- (سنعذبهم مرتين) التوبة ١٠١/
- (أولا يرون أنهم يفتنون في كل عام مرة أو مرتين) (التوبة ١٢٦/)
- (ياايهاالذين أمنو ليسأذنكم الذين ملكت ايمانكم و الذين لم يبلخوا العلم منكم ثلاث مرات) النور ٥٨/
- (ولقد مننا عليك مرة أو خرى) طه ٣٧/

(**الطلاق مرتان**) لە لەفزدا هەواڵ (خبر) ە و لە واتادا فرمان (أمر)ە بەجیاکردنەوەی تەلاّق ، لە هاو شێوەی ئەوەدا هاتووە لە حوکمگەلێکی زۆر دا بە چەند ئایەتێك لەم جۆرەدا ، لەوانە (**والوالدات يرضعن اولادهن**)واتە باشیر دەبن (**والمطلقات يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء**) واتە : با چاوەڕوان بن ، کە بەهەواڵ هاتووە بەلاّم فرمان دەگەیەنێت ، ئەوەش بۆ زیاتر جەخت کردنەوەو توند گرتنی ئەوەیە کەلە ناواخنی فەرماندایە ، خۆ فەرمان دانیش بەهەرشتێك بەرگریکردن لەدژی ئەو شتە لە ناواخنیدایە ، و بەرگریکردن (النهی) یش تەنها بۆ شتێك دەبێت کە خراپە (المفسدة)ی تێدا بێت ، و کارکردن بە پێچەوانەی ئەو فەرمانە دان نانە بەو خراپەیەدا.

· پێشەوا فەخری ڕازی[1] دەڵێت : (ئەم ووتەیە هەرچەند لەفزەکەی لەفزی هەواڵە بەلاّم ئەوەندە هەیە کە واتاکەی هەر فەرمانە، واتە تەلاّق بدەن بە (مرتين) واتە (بە دووجار) وە ئەو لادانەش لە لەفزی (الامر)ەوە بۆ (الخبر) تەنها لەبەر ئەوەیە کە باسمان کرد کە بریتیە لەوەی دەربڕینی فەرمان بە لەفزی هەواڵ سودی جەخت کردنەوە لە واتای فەرمانەکە دەگەیەنێت . کەواتە ئەوە سەلما کە ئەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان

[1] سەرلە تەفسیری (التفسير الكبير)ی فەخری ڕازی بدرێت ٦/١٠٤

بەجیاکردنەوەی تەلاّقەکان دەگەیەنێت و جەخت لەسەر ئەو فرمانە دەکاتەوە و موبالەغەشی تێدا دەکات ،پاشان ئەوانەی ئەم قسەیەدەکەن ناکۆکن لەسەر دوو قسە :

یەکەمیان : کە هەڵبژاردەی زۆرێك لەزانایانی ئاینی یە ئەوەیە کە ئەگەر تەلاّقی دا بە دوو یان بە سێ تەلاّق ئەوە تەنها یەك تەلاّقی دەکەوێت کە ئەم قسەیە پەسەند ترە لەڕوی قیاسەوە چونکە نەهی واتایەکی گشتگیر بۆ نەهی لێکراوە کە بەسەر خراپەیەکی لەپێشتردا دەگەیەنێت ، دەی ئەگەر بووتریّ دەکەوێت ، هەوڵێکە بۆ هێنانە بوونی ئەو خراپەیە ، کە ئەوە ڕێپێدراو نیە ، کە واتە پێوستە حوکم بدریّ بە نەکەوتنی تەلاّقەکە .

گرێبەستەکان چ ئەوانەیان کە بنیات نەرن (**الانشاءات**) یان ئەوانەی کە کۆڵخەرن (الاسقاطات)ماهیەتی معنەویان نایەتە دی و شوێنکاریان لەدەرەوەدا بەدی نایەت تا نوطق نەکرێت بەچەند لەفزێك کەواتای ئەوان بگەیەنێت)[1]

وە ئەو لەفزانەی بونیادیان دەنێن و بەدییان دەهێنن، کەواتە ووتەی مێردەکەبۆ خێزانەکەی خۆی کەدەڵێت (تەلاّقت کەوتبیّ) حەقیقەتێکی مەعنەوی واقیعی بەدیدێنێت لە کاتی بونیاد نانیدا ، دواتر ئاوەڵناوی بە ژمارەی دوو یان سێ بۆ دەهێنێت کە ئاوەڵناوێکی باتڵە.

• ئەبو حەییان دەڵێت [(١)]: (ئەگەر ووتی تەلاّقت کەتبیّ دووجار یان سێ ئەوە تەنها یەك تەلاّقی دەکەوێت ئەو چاووگ (مصدر) ی تەلاّقەکەیە و دەشخوازێت لە ژمارەکەدا خودی ئەو کردارەی کە ئەو کاری تیا دەکات دووبارە ببێتەوە لە بووندا وەك چۆن دەڵێت : لێمدا بە دوو لێدان یان بە سێ لێدان ، چونکە مصدەرەکە ڕونکەرەوەی ژمارەی کردارەکەیە دەی هەرکاتێك لە بوندا دوبارە نەبێتەوە بونی ژمارەکەی مەحاڵە ،کەواتە هەر کات ووتی : هەرسێ تەلاّقەت کەوتبیّ ، ئەمە لەفزی یەکێکەو واتای یەکێکیشە ئیتر یەکێك مەحاڵە ببێتە دووان یان سیان ، وێنەی ئەمەش ئەوەیە کە کەسێك شتێکی فرۆشتبیّ بەپیاوێك و لە کاتی قەسەکردنەکەدا بڵێت ئەوا سێ جار پێم فرۆشتی لەفزی (سێ) کە لەغوە و حسێبی بۆ ناکرێت و بەرامبەریش نیە لەگەڵ ئەوەی پێش خۆی.

وەبونیات نەرەکانیش (الانشاء ات) دووبارە مەحاڵە دووبارە بوونەوە تیایاندا تاوانەبێت گشتیەکە دەست بدات بۆ ئەو بونیاد نانە ، و ئەمەش سەختە پەی پیّ بردنی لەسەر کەسێك کە ڕاهاتووە بەتێگەیشتن لە قسەی ئەو کەسەی ووتویەتی (تەلاّقت کەوتبیّ دووجار یان سێ جار کە ئەو لای وایە تەلاّقەکەی دووجار یان سێ جار دەکەوێت) لەمەوە و لە هەنگاوە یەك لەدوای یەکەکانی تەلاّقدانەوە وەردەگیرێت کە تەلاّق چەند دانەیەکیان بەشوێن یەکدا نایەن ، ئەگەر تەلاّقی دا بە زیاتر لەیەك ئەوە تەنها یەك تەلاّقی دەکەوێت و تەلاّقی دووەم و سێ یەم ناکەوون مەگەر ڕیجعەت و گێڕانەوە یان گرێبەست (عقد) ێکی نویّ بکەوێتە

[1] سەر لە (نظام الطلاق في الاسلام) ی أحمد شاکر ص٤٦ و دوای ئەو بدریّ.

نێوان تەلاّقەکان ، لەمەشدا چون یەکە بەلەفزی (انت طالق ثلاثاً) بێت یـان (انـت طـالق، انـت طالق،انـت طالق)بێت .

**دووەم / سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ):**

گرنگترین ئەو فەرمودانەی خاوەنی ئەم ڕایە پشتی پێدەبەستن ئـەو فەرمودەیـەی ئیبنـو عەبباسـە کەپێشتر باسمان کرد و دەمەقاڵەی گەرمان لەسەری کرد و چی لە بارەیەوە ووترابوو هێنامان، کەئـەوە فەرمودەیـەکی سەلماو گێڕراوەیە لە ئەهلی فەرموودەوە بەچەند گێڕانەوەو چەند ڕێگەیەکەوە لەوانە :

أ- موسلیم لەصەحیحەکەیدا دەریهێناوە لە ڕێگەی عەبدوڕڕەزاقەوە لە موعەممەرەوە لـە عەبدوڵڵای کوڕی گاووسەوە لە باوکییەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە ووتویەتی : (ئەو کات تەلاّق لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئەبوبەکرو دوو ساڵی فەرمان ڕەوایەتی عومەردا سیانی بەیەك تەلاّق دەکەوت .ئیتر عومـەر ووتـی : بەڕاستی خەڵك پەلەیانە لەشتێکدا کە خودا لەسەر خۆیی بۆ بڕیار داوون ،کەواتە ئەگەر ئێمە لەسەر ئـەوانی حسێب بکەین ئەوا لەسەریان حسێب دەبێت)[1]

ب- ئەبو داود لە سونەنەکەیدا [(2)]دەریهێناوە لەڕێگەی ئەحمەدی کـوڕی صـالحەوە لـە عەبدوڕڕەزاقی کـوڕی ئیبنو جورەیجەوە لە ئیبنو طاوسەوە لە باوکییەوە کـە ئـەبو صـەهبا بـەئیبنو عەباسـی ووتـوە: (أتعلـم انمـا کانت الثلاث تجعل واحدة على عهد النبى (ﷺ)و أبي بكر و ثلاثاً مـن إمـارة عمـر ، قـال ابـن عبـاس : نعم)[2]

ج- وە لەڕێگەی حەمادی کوڕی زەیدەوە لە ئەیوبەوە لە ئیبراهیمی کوڕی مویەسسەرەوە لـە طـاوسـەوە : کـە ئەبو صهبا ووتی بە ئیبنو عەباس : ألم يكن الطلاق الثلاث على عهد رسول الله (ﷺ)واحدة ؟ قال : قـد كان ذلك فلما كان في عهد عمر تتابع الناس في الطلاق فأجازه عليهم[3]

د- حاکم لـە (المستدرك) دا گێڕاویەتـەوە کـە : ئـەبو جـەوزاء هاتوەتـە لای ئیبنـو عـەباس و ووتویـەتی : ئایـادەزانی سـێ تەلاّقـە لەسـەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ)دا دەگێڕرانـەوە بـۆ یـەك تـەلاّق ؟ ئـەویش لەوەلاّمـدا فەرمووی : بەڵێ ، حاکم دەڵێت ئەم فەرموودەیەپشتی ساغە(صحیح الاسناد)ە ـ اغاثة اللهفان ١/٣٠٣

هـ- ئەبو داود بە گێڕانەوەیەکی تر دەریهێناوە کە بریتیە لەوەی: پیاوێك هەبوو ناوی ئەبو صـەهبا بـوو زۆر پرسیاری لە ئیبنو عەباس دەکرد ، ڕۆژێك پێی ووت : ئایا نازانی پیـاو ئەگـەر ژنەکـەی سـێ تەلاّقـە بدایـە پێش گواستنەوەی دەیان کرد بەیـەك تـەلاّق ، لەسـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ)و ئـەبوبکر و سـەرەتای فەرمان ڕەوایی عومەردا ؟ ئیبنو عەباس ووتی : بەڵێ وابوو ئەگەر پیاوێك سێ تەلاّقـەی خێزانەکـەی بدایـە

---

[1] فتح البـاری شـرح صـحیح البخـاری ٣٦٣/٩ ، سـنن ابـی داود مـع حاشـية عـون المعبـود ٢٢٨/٢، نيـل الأوطـار ٢٥٨/٦ ، سبل السلام ٢٢٥/٣

٢ ابی داود مع حاشية عون المعبود ٢٢٨/٢

مادەم نەیگواستبووەوە بەیەك تـەڵاق حسێبیان دەكـرد لەسـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ)و ئەبوبـەكر و سەرەتای فەرمانڕەوایی عومەردا ، بەڵام كاتێ خەڵكی بینی پەلەیانـە لەتەڵاقدانـدا فـەرمووی : لەسـەریان حسێب بكەن چەند تەڵاقیان خست ئەوەندەیان بۆ بخەن و حوكم بە كەوتنی بدەن ) .

بێگومان ئەوكەسەی ئەم فەرموودەیە بە نەخۆش دەزانێت لـەو زانایانـەی دەڵـێن تـەڵاقی سـێ بەسـێ بەیـەك لەفز دەكەوێت دەستی گرتووە بەڕەوەند(سیاق) یئـەم گێڕانـەوەوە لەسـەر بنـەمای ئـەوەی كـە فەرموودەكـە لەژێر ڕۆشنایی ئەم گێڕانەوەیەدا ئەو ئیددیعایە ناسەلمێنێ كە تـەڵاقی سـێ بەسـێ تـەنها یـەك تـەڵاقی پـێ دەكەوێت بەرەهایی سەبارەت بە ئافرەتی گوێزراوە و نە گوێزراوە هەروەك ئەوانـەش جیـاوازی دەخەنـە نێـوان گوێزراوە و نە گوێزراوە هەر پشتیان بەم گێڕانەوەیە بەسـتووە و دەڵـێن بـۆ ئـافرەتی گـوێزراوە هـەر سـیانی دەكەوێت بەڵام بۆ ئافرەتی نەگوێزراوە تەنها یەك تەڵاقی دەكەوێت .كە لەڕاستیدا ئێمـە موناقەشـەی ئـەم ڕا دەگمەنەمان كرد كە گوێزراوە و نەگوێزراوە جیا دەكاتەوە وەك چۆن قسەی تـەواومان لەسـەر فەرموودەكـەی ئیبنو عەباس كرد بە هەموو جۆرە گێڕانەوەكانیـەوە ، وە ناشمانـەوێت جـارێكی تـر بـچینەوە سـەری و پـەنا بەرینە بەر دووبارە بوونەوە و درێژ دادڕییەكی ماندوكەر

بەڵام پێم خۆشە ئەوە زیاد كەمە سەر ئەوەی پێـشوو كـە هەنـدێك لـەزانایان سـەبارەت بـە گرێـی (قبـل ان یـدخل بهـا) دەیڵـێن : ئیبنـو لقـەییم(خـوای لێـڕازی بێـت)دەڵێـت : (گێڕانەوەكـەی طـاووس خـۆی لـە ئیبنوعەباسەوە هیچ شتێكی تێدا نیە لە (قبل الدخول) دا ، وە باسكردنی ئەم گرێیـەش لـەم گێڕانەوەیـەدا بۆ ڕونكردنەوەی پرسیارێكی تایبەتە بەباسـی تـەڵاقی ئافرەتێكـەوە كـە هێـشتا نـە گوێزرابێتـەوە و ئیبنـو عەباسیش وەڵامی هەمان پرسیار دەداتەوە ، ئیتر ئەم گرێ(قید)ە دژە تێگەیشتنی (المفهوم المخالفة) نیە.

* وە لە كتێبی (عون المعبود على سنن ابي داود) ٢/٢٢٨ دا هاتووە : (دەستی گرتووە بەم گێڕانـەوەوە ئەو كەسەی كە پێی وایە تەڵاق دراوێك گوازرابێتەوە هەرسێ تەڵاقەكەی دەكەوێت و ئـەوەش نەگوازرابێتـەوە تەنها یەك تەڵاقی دەكەوێت . ئەوەش وەڵام دەدرێتەوە بەوەی كە مەرجدار كردنی بە(قبل الدخول) دژنییە بـە ڕاستی و دروستی گێڕانەوە ڕاستەكانی تر كە باسی تەڵاق دراوێكە پاش گواستنەوە ، وە ئـەو پـەڕی قسـەش لـەم گێڕانەوەیـەدا ئەوەیـە كـە دان دەنێـت بـە بەشـێك لـە واتـای ئـەو گێڕانـەوە ڕاسـتەدا كـە بەشـوێن ئـەو گێڕانەوەیەدا دێت ، وە ئەوەش هیچ پێویست ناكات كە تایبەت بێت بەو گێڕانەوەوە كە دانی پیا نا بێت .

وەئەم فەرموودەیە (فەرموودەكەی ئیبنو عەباس) فەرموودەیەكی صحیحە و ئـەوە دەگەیـەنێت ئەگـەر سـێ تەڵاق بەیەكەوە خران تەنها یەك دانەیان دەكەوێت. سنن ابی داود ٢/٢٢٨

*عەسقەلانی لە قورتبییەوە دەگوێزێتەوە : (هەرسێ تەڵاقت كەوتبێ (انـت طـالق ثلاثـاً) دەسـتەواژەیەكی پێكەوە پەیوەستە و لێـك جیانیـە . ئـیتر كـەی دروسـتە بكرێتـە دوو ووشـەو دوو بەشـەوە و هـەر یـەكێكیان حوكمێكی بدرێتی) صحیح البخاری ٣٦٣/٩ ، ئیبنو لقەییمیش دەڵێت : (فەرموودەی (سێ تـەڵاق یـەك

تەڵاقە)سێ کەس لە ئیبنو عەباسەوە گێڕاویانەتەوە : طاوس کە دیارترین کەسە لەوی گێڕاوەتەوە و ئەبوو صەهبای عەدەوی و ئەبو لجەوزا)[1]

* لە سبل السلام دا هاتووە:[2] (ڕواڵەتی قسەی ئیبنو عەباس ئەوەیە کە سێ تەڵاقە یەك تەڵاقەو ئیتر ئەو سێ تەڵاقە بە هەر شێوە دەربڕینێك دەر ببڕێت).

* ئیبنو تەیمیە (خوای لێڕازی بێت)دەڵێت : (وانازانین یەك کەس لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(صلی الله علیه و سلم )خێزانی خۆی تەڵاق دابێت بە یەك ووشە و ئەویش پابەندی کردبێت بە هەر سیانەوە و خستبێتی،هیچ فەرموودەیەکی صەحیح یان حسن لەو بارەیەوە نەگێڕراوەتەوە ، ئەهلی کتێبە باوەڕ پێکراوەکانیش هیچیان لەو بارە نەگێڕاوەتەوە ، بەڵکو ئەو فەرمودانەی لەو بارەوە هاتوون هەر هەموو یان لاوازن بەیەك دەنگی زانایانی فەرموودە ، نەك هەر لاواز بەڵکو دانراویشن ، بەڵکو ئەوەی لە صەحیحی موسلیم و غەیری ئەویشدا لە سوننەن و مەسانید هەیە ئەوەیە کەلە طاووسەوە لەئیبنو عەباسەوە کە ووتویەتی : ئەوسا تەلاق لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)وئەبوبکر و سەرەتای فەرمان ڕەوایی عومەردا تەلاقی سێ بەسێ یەك تەلاق بووە .

---

[1] اغاثة اللهفان (١/٣٠٣)

[2] سبل السلام( ٣/٢٢٦)

**عومەر ووتویەتی : خەڵکی پەلەیان کردووە لەشتێکدا کە شیاوی پەلە کردن نیە بۆیە ئێمە ئەو پەلەکردنەو خستنی هەر سێ تەڵاقیان لەسەر حسێب دەکەین)[1]**

**※ وە ئیبنولقەییمیش دەڵێت : (ئەوە قورئانی پیرۆز ، ئەوە سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەوە زمانی عەرەبی ،ئەوە سروشتی ووتو وێژ ،ئەوە جێ نشینی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وەئەوە یارانی هەر هەموویان لەگەڵیدا لە سەردەمی خۆیدا ، وەئەوەش سێ ساڵ لە سەردەمی عومەر لەسەر ئەم ڕێڕەوە بوون (واتە کە تەڵاقی سێ بە سێ بەیەك بوو) ئەگەر کەسێك یەك بەیەك بەیەك ناوەکانیان بهێنێت و بیانژمێرێت بۆی دەردەکەوێت کە ئەوان هەرهەموویان سێ تەڵاقەیان بە یەك دادەنا ئیتر یان بە فەتوا یان بە دان پیانان ، گریمان ئەگەر یەکێکیش بوویێت لەوان پێی وانەبووبێ ئەوە خۆ هیچ کات بەرپەرچی فتوایەکی لەو جۆرەی نەداوەتەوە[2]**

---

**(١) (مجموع فتاوی) ی ابن تیمیه ( ٣٣/١٢-١٣)**

**(٢)- سەیری (اعلام الموقعین) (٣/ ٣٤) بکرێت .**

**سێیەم – بە بەرا گرتن (القياس)**

دوا بەڵگەی ئەو کەسانەی ئەم ڕایەیان هەیە بریتیە لە بەبەرا گرتن (القياس) لە سەر هەندێك لەو بڕیارانەی کە جار لە شوێن جاری تێدا لە بەرچاو گیراوە، وە بۆئەوە نمونەی زۆریان هێناوەتەوە لە قورئان و سوننەت و دەستەواژە گرێبەستەکان و دانپێدانان و هتد .لەوانە :

أ/ خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمویێت ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الصَّادِقِينَ(٦)وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنْ الْكَاذِبِينَ(٧) وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الْكَاذِبِينَ(٨)وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَآ إِنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾ (النور )(٦-٩)

ئەگەر پیاوەکە لە بەردەم قازیدا چوار جار ووتی شایەتی دەدەم بەخوا من راست دەڵێم ، یان ژنەکە چوار جار وتی شایەتی دەدەم بەخوا کە پیاوەکەم درۆ دەکات لەو تۆمەتەی دەیخاتە پاڵ من ، ئەوە یەك شایەتیدانە و نابێتە چوار شایەتی دان ، ئیتر چۆن قسەی ئەو پیاوە کە دەڵێ سێ تەڵاقت کەوتیێ دەبێتە سێ تەڵاقدان؟

* ئیبنولقەییم دەڵێ چ قیاسێك لەمە راستترە ؟ وەهەروەها هەموو شتێکی تریش کە ژمارە تیایدا لە بەر چاو گیرابێت لە دانپێدانان و نمونەی ئەو ، هەر وە لەبەر ئەمەیشە ئەگەر دانپێدانەری (المقر) زینا بلێت : من داندەنێم بە زینادا چوارجار ئەوە هەر یەك جار حسێب دەکرێت لەسەری ، هاوەڵان بە (ماعیزی کوری مالیك) یان ووت ئەگەر چوارجار دانی پێدا بنێیت پێغەمبەر (ﷺ)بەردباران(الرجم) ت دەکات ، ئەگەر وتی دانی پێدا دەنێم چوار جار ئەوە هەر یەك دانەیە، دەی بۆ تەڵاقیش هەر وایە .

ب/ئەگەر ووتی سەد جار (سبحان الله) یان (الحمدلله)ئەوە یەك جاری بۆ حسێب دەکرێت .

ئیبنو تەیمییە دەڵێت : فەرمودەی خوای گەورە (الطلاق مرتان) واتەجارێك و جارێکی تر وەك چۆن ئەگەر بووترێت بە فلانە کەس دووجار یان سێ جار یان سەد جار (سبحان الله) بکە بێگومان پێویستە (سبحان الله) بکات ئەوەندە جار جا فەرمانەکەی بە جێ هێناوە، ئەگەر ئەو کەسە بیەوێ کورتی بکاتەوە و بلێت دوو جار (سبحان الله ) یان سێ جار یان سەد جار (سبحان الله ) ئەوە (سبحان الله) ی نەکردوە بێجگە لە یەك جار. وەخوای گەورە نەیفەرمووە تەڵاق دوو تەڵاقە بەڵکو فەرموویەتی تەڵاق دوو جارە ، جائەگەر کەسێك بە خێزانەکەی خۆی ووت : تەڵاقت کەوتبێ دوو یان سێ یان دە یان هەزار تەڵاقە ئەوە تەڵاقی نەداوە جگە لەیەك جار.

و فەرموودەکەی پێغەمبەریش (ﷺ)بۆ (جوەیریە) ی دایکی ئیمانداران کە فەرمووی من لە پاش تۆ چوار وشەم ووت ئەگەر بکێشرێن بە هەموو ئەوەی لەمڕۆوە تۆ وتووتە بە قەد هەموو کێشی هەیە ئەوانیش : سبحان الله عدد خلقه سبحان الله زنة عرشه سبحان الله رضى نفسه سبحان الله مداد كلماته ،پێشەوا موسلیم لە صە حیحەکەیدا دەریکردوە کە واتاکەی ئەوەیە کە خوای بەرزو بێگەرد شایستەی تەسبیحات کردنە بە ژمارەی ئەوە. کەواتە ئەندازەکە جارێك دەبێت ئاوڵناوی کرداری بەندە ، کە کردارەکەی سنوور دارە

، وه جارێكیان دەبێته ئەوەی كه پەروەدگار شایانیەتی كه ئەوه كێشەكەی زیاد كردوه بەو ئەندازەیە ، ئەگینا ئەگەر نوێژ خوێن له نوێژەكەیدا بلێت (سبحان الله عدد خلقه)واته (سوبحانەڵلا به ئەندازەی ژمارەی دروست كراوەكانی) بێگومان ئەوه سوبحانەڵلای نەكردووه بێجگه له یەك جار .

وه كاتێ پێغەمبەری خودا داینـاوه به شوێن نوێژدا سیوسێ جار بووترێت (سبحان الله) ،هەروەها (الحمد الله)و(الله أكبر) ، ئەگەر كەسێك ووتی (بەئەندازەی ژمارەی درووست كراوەكان سبحان الله ، الحمد لله ،الله أكبر ) ئەوه یەك جاری بۆ دەنوسرێ لەلای خودا )¯ (مجموع فتاوى ) ی ئیبنو تەیمیه (٣٣/١٢-١٣)

هەندێ له زانایان دەڵێن ئەم ڕایه كۆڕا (الاجماع) ی لەسەر بووه لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)دا و ئەبەبكر سەرەتای فەرمان ڕەوایی عومەر وه ئیجماعێكی تر بەر پا نەبوه تا پوچەڵی بكاتەوه .

* ئیبنولقییم دەڵێت : (مەبەستەكه ئەوەیه ئەم قسەیه (تەلاقی سێ بەسێ یەكێكە)قورئان وفەرموودە و قیاس و ئیجماعێكی كۆن ئەوه دەگەیەنن و ، دوای ئەویش ئیجماعێكی تر نەهاتووه كۆنەكە پوچەڵ بكاتەوه . بەڵام پێشەوای موسوڵمانان عومەری كوڕی خەتتاب كەبینی خەڵك سوك سەیری تەلاق دەكەن و زۆربەیان بەسەر یەكەوه هەرسێ تەلاقەیان دەخەن بە مەصلەحەتی زانی سزایان بدات به لەسەر حسێب كردنیان (خۆیان چەندیان خستووه ئەوەندە تەلاقیان بخرێت وحوكم به كەوتنیان بدرێت ، تابزانن هەركەسێك لەوان هەرسێ تەلاقه بخات به یەك جار تەلاقی دەكەوێت و ژنەكەی لێ دەبێتەوه به بێگانەو لەسەری حەرام دەبێت مەگەر دوای شوكردنێك و تەلاق دانێكی دیكه به شێوەیەكی سروشتی كه پیاوێك ئارەزومەندانه مارەی بكات و دواتر بەیەكەوه نەگونجێن و جیا ببنەوه (پاش گواستنەوه) ، وه ئەم شوكردنەش مەبەستی ماره بەجاشی له پشتەوه نەبێت)ـ اعلام الموقعین(٣/٣٥-٣٦)

**بەسەندكردن ( الترجیح ) :**

بەراستی من پیاوی بەسەندكردن (الترجیح) ودیاری كردنی بەهێزترین ڕا نیم و ئیدديعای ئەوەش ناكەم .

بەڵام ترجیحی من بریتییه له دووبارەكردنەوەی كورتەیەكی ئەوەی پێشینان وپاشینان ووتویانه له بابەتێكی وامەترسیداردا كەپەیوەندی ڕاستەوخۆی بەژیانی ملیۆنەها موسولمانەوه هەیە، وه ئەوەش كورت دەكەمەوه لەمەی خوارەوه دا :

خوای گەوره دەفەرموێت (یا ایهاالذین أمنوا أطیعوا الله و اطیعوا الرسول وأولی الأمر منكم فإن تنزعتم في شيء فردوه إلى الله والرسول إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الأخر ذالك خير و أحسن تأويلاً) النساء-٥٩

هەندێك لەزانایان دەڵێن : گوێڕایەڵی خوای گەوره واته كاركردن بەقورئان، وەگوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ)واته كاركردن به سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) ، وەگوێڕایەڵی فەرمانڕەوا واتەكاركردن بەئیجماع ، و گەڕانەوەش بۆلای خوا واتەكاركردن بەقیاس .

بەڵام به بڕوای من مەبەست لەم ئایەتەپیرۆزه ئەوەیه واته: سەرچاوەی سەرەتا و كۆتا بۆ چارەسەری گرفت و كردنەوەی گرێ كوێرەكان تەنها خوای گەورەیەو بەس، ئیتر ئەو گرفته سروشتی هەر جۆربێت ، هاوشێوەی

ئەوەش لەژیانی دوونیایی خۆماندا ئەوەیە کە هەموو مەسەلەیەك کەدەیجولێنی سەرەتا لەسادەترین کارمەندەوە دەست پێ دەکەیت ئەگە ر چارەسەر نەکرا پلە بەپلە دەیبەیتە سەرووی ئەو تادەگاتە بەزترین دەسەلاّت (کە سەرۆکی وولاّتە) ، وەلەم مەسەلەیەی تەلاّقیشدا ئەوەمان بۆ ڕوون بوەوە لەوەی خستمانە بەر چاو لەڕابردوو دا کە بابەتێکی پڕلەکێشمەکێشو نا کۆکی یە هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە تابەئەمڕۆ، وە بۆشمان دەرکەوت کەبەڵگەی هەمولایەك بەڵگەی گومانی (ظنی)ن وقسەی یەکلاکەرەوە و واتای گەیاندنێکی قەتعی ناگەیەنن ، بەم پێ یە ڕای هەمولایەك ئەگەری ڕاستیش و هەڵەیش هەڵدەگرێت ، کەواتە حوکمی مەسەلەکە جێی مشتومڕە وخوای گەورەش دەفەرموویێت:(فان تنازعتم في شیء فردوه الی الله) دەی بائەم مەسەلە خیلافیە بگێڕینە وە بۆلای خوا، بۆ لای قورئانی پیرۆز ، وبزانین قورئان چی تێدایە؟

خوای پەروەردگار دەفەرموێت (الطلاق مرتان) .

نهێنی هەڵبژردنی ئەم دەستە واژە یە چی یە ؟

بۆچی نەیفەرموو دووان یان دوتەلاّق ؟

قورئان ژمارەی باس کردوە ؟ یان (جار) ؟ وە ئایا ئەم دوانە جیاواز یان هەیە؟

ئایا فەرمانی خوا واجب بون دەگەیەنێت ئەگەر بەڵگەیەکی لادەر (القرینة الصارفة) نەبێت یان سوننەت ؟

ئایا ئیجتیهاد دروستەلەگەڵ بونی دەقێکی ئاشکرا دا ؟

ئایا دەقی قورئانی تا ئەم ڕاددەیە ناڕونی تێدایە کە ببێتە هۆی ئەوەی ئەم ناکۆکیە بەردەوامەی لێبکەوێتەوە ؟

بۆ وەلاّمدانەوەی ئەم پرسیارانەو ڕونکردنەوەی دیاری کردنی ئەوەی دەبێتە قورسایی تای تەرازووی خۆ بەستنەوە بە سێ جارەوە (المرات الثلاث) ، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای خوای گەورە ، بۆلای قورئانی پیرۆز ،بۆلای دەقەکانی بە شێوە موجتەهید یەك لە مەبەستەکانی تێ بگات هەرکەسێك کە شارە زاییەکی لە زمانی عەرەبیدا هەیە چ مجتهید بێت یاخود کەسێکی سادە :

١- قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە بە دابەش کردنی سێ تەلاّقە بە سەر (سێ) جاردا بە دەقێك کەواتاکەی ڕون دەگەیەنێت بۆ کۆتایی هێنان بە پەیوەندی هاوسەرگیری کە تەنها بەهاتنەدی ئەو دابەشکردنە بەسەر هەرسێ جارەکەدا دەبێت ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت (الطلاق مرتان فامساك بمعروف أو تسریح باحسان) البقرة /٢٢٩

٢- (الطلاق مرتان): فەرمان و داواکارییەکی مسۆگەرو دوور لە ملە جیڕەیە ، بەلاّم لەبەرگی رستەیەکی هەواڵیدا (الجملة الخبرية) داهاتووە ، تا زیادە جەخت کردنەوەو بایەخ دان بگەیەنێت لەسەر فەرمانەکەی خوای گەورەو نەبەزاندنی سنورەکەی (تلك حدودالله فلا تعتدوها ومن يتعد حدود الله فأولئك هم الظالمون) البقرة /٢٢٩

**٣- فەرمان کردن بەشتێك یاساغ کردنی دژەکەیەتی ، ئەمە یاسایەکی شەرعی و چەسپاوە و زانایانی فیقهو ئوصول بڕیاریان لەسەر داوە ، کەواتە فەرمان کردن بەجارەکان قەدەغەکردنی ژمارە یە (دوو یان سێ) چونکە لە باسی جاردا بەرژەوەندی مۆڵەتدان و سەر لەنوێ بونیادنانەوەی ژیانی هاوسەرگیری هەیە ، وەك خوای گەورە ئاماژەی پێدەکات و دەفەموویت ( لاتدری لعل الله يحدث بعد ذالك أمرا ) الطلاق ⁄ ١**

**وە کۆکردنەوەی هەرسێ تەڵاقەکە لە یەك جاردا کارێکی خراپەو ئەو دەرگایە بەڕووی ژن و مێردەکاندا دادەخات.**

**٤- خوای گەورە دەیەوێت تەلاق دان بە سێ جار بێت ، وەئەو قسەیەش کە ڕێ دەدات کۆ بکرێنەوە هەرسیان لە یەکجاردا مادەم پیاوەکە خۆی دەیەوێت ، ئەمە زاڵکردنی  ویستی ئەوی تێدایە بەسەر ویستی خودا ، وە ئەوەش لە شەریعەتی ئیسلامدا شتێکی وەرنەگیراو و ڕەتکراوەیە.**

**١- دەقی (الطلاق مرتان) واتای گەیاندنێکی یەکلا کەرەوە دەگەیەنێت لەسەر دوو جار کەپێویست دەکات کاتێك بکەوێتەنێوانیان ، وەلێکدانەوەی ئەو دووجارە بەدوو دانە یان دووتەلاق ، یان  ماناکردنی سێ جارەکە( المرات الـثلاث) بەسێ تەلاق لەیەك جاردا بێ ئەوەی کات بکەوێتە نێوانیان ، لۆژیکی زمانی عەرەبی پشتی تێدەکات وقەبوڵی نیە.**

**٢- لەفزی(الإثنين) یان (الثلاث) بیدعەیە چونکەداهێنراوی مرۆڤ خۆیەتی ، خراپیشە(سیئە) یە چونکە پێچەوانەی فەرمانێکی ڕاشکاوی خوایە ، وداهێنراوی خراپیش(البدعة السيئة) وەرنەگیراوە وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمویت ((كل عمل ليس عليه أمرنا فهو رد )).**

**٣- لەدانانی ژمارەلەجێ ی جارداگرفتی نەهێشتنەوەی ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ژیانی هاوسەرگیری هەیە لەپاش پەشیمان بوونەوە نە بەگەڕاندنەوە(الرجعة) و نە بەگرێبەست (العقد) ی نوێ، کەئەوەش دژە بەفەرموودەی خوای گەورە ((مايريدالله ليجعل عليكم من حرج ولكن يريد ليطهركم)) المائدة⁄٦ .**

**٤-لەفەتوادان یان بڕیاری هەرسێ تەلاق بەیەك دەربڕین دا سەختی و بێ هیوایی ژن ومێردەکەی تێدایە، و بڕیاری ڕوخاندنی کۆشکی هیوا و بەبادانی ڕەنجی چەندساڵەیانە لەچاوتروکانێکدا و بەیەك سات  لە ساتە ناسروشتیەکانی  ژیان.**

**٥-کەئەمەش ناکۆکە لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی خوای گەورەدا کەدەفەرمویت : ((يريدبكم الله اليسر ولا يريد بكم العسر) البقرة ⁄ ١٨٥ ولەگەڵ فەرموودەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) کەدەفەرمویت((يسروا و لاتُعسِروا))**

**ئەگەربووترێ : کۆسپ ونارەحەتیەکە هۆکارەکەی مێردەکە خۆی بووەو بەویستی ئازادانەی خۆی کردویەتی ، لەوەلامدا دەڵێم :**

**پیاوەکە جاهیل و هەڵەیە ، وەخوای گەورەش چاوپۆشی لەیەك تەلاقی لێ کردووەولێی ناگرێت و لێپێچینەوەی لەسەرلابردووە ، وەك دەفەرموویت((و ليس عليكم جناحٌ فيما أخطأتم)) وەپێغەمبەریش (ﷺ)دەفەرمویت (رفع عن أمتي الخطأ و النسيان وما استكرهوا عليه) کەواتەپێویستەلەسەرموفتی وقازی کەئاگاداری بکەنەوە ئەوە**

**هەڵە و گاڵتـە و سـوكایەتیكردنە بـەقورئان. وەك چۆن كەباسـی پیاوێكیـان كـرد لەخزمـەتی پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ)هەرسێ تەلاقەی ژنەكەی خۆی داوە ، بەتورەییەوە هەستایە سەرپێ و فەرمووی ((أیلعب بكتـاب الله وأنـابین أظهركم) "(نیل الاوطار) ی شەوكانی (٦⁄٢٢٥)ـ واتە ئایا سـوكایەتی بـەقورئان دەكرێـت لـەكاتێك داكـە مـن هێشتا لەناوتان دام!!!**

**٦-((الطلاق مرتان)) نـاڕوون (مجمـل) نیـە ، تاسـوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ) ڕوونـی بكاتـەوە ، وەگـشتی نیـە تـا تایبەتی بكات، وەڕەها (مطلق) نیە تـا بیبەسـتێتەوە (التقییـد) ، وەبڕیـارێكی بێـدەنگ لێكـراو(مـسكوت)یـش نیەتاسوننەت بڕیاری بدات ، كەواتە ڕۆڵی ئەوفەرمودانەی لـەم بارەیـەوە هـاتوون كـورت بوەتـەوە لەجەختكردنـەوە لەسەرئەوبڕیارەی كەقورئان دەری كردوە كەبریتیە لەدابەشكردنی تەلاقەكان بەسەر سێ جاری جیادا.**

**كەواتەهیچ زانایەك یان فەقیهێك یان قازی یەك بۆی نیە كار بكات بۆ لادانی ئایەتی (الطلاق مرتان) لـە واتـا ڕاستەقینە ڕونە ڕاشكاوانەكەی خۆی .**

**٧- (الطلاق مرتان) دەقێكی ڕاشكاوی ڕوونە لە گەیاندنی واتای بڕیارەكەدا ، قسەی تێـدا ناهێڵێتـەوە . دەی خـۆ زانایانی ئاینی لە ئوصولی و فەقیهەكان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كە (لامساغ للاجتهاد فـی مـورد الـنص) واتـە: هیچ مۆڵەتێك نیە بۆ ئیجتیهـاد كـردن لـە شـتێكدا كـە دەقـی لـە بـارەوە هاتبێـت . كەواتـە هـەموو دەمەقاڵـەو چەماندنەوەو ئیجتیهادێك لە لێكدانەوەی ئەم دەقەدا وەرنەگیراوو پشتگوێ خراوە بە گوێرەی ئەم یاسایە .**

**٨- چێژ بردنی هەریەكە لە ژن و مێرد لە یـەكتری بڕیـارێكی شـەرعی چەسـپاوە لەبـەر هۆیـەكی شـەرعی كـە بریتیە لە گرێبەستی هاوسەرگیری دروست و چەسـپاو بـە چەسـپانێكی بـێ قـسە لـە نێوانیانـدا، دروسـت نیـە هەڵگرتن و هەڵوەشاندنەوەی ئەم گرێبەستە شەرعیە بە بەڵگەیەكی گومانی (ظنـی) لـەو بەڵگانـەی كەهەنـدێ لە زانایان لەفەرمووده تاك كەسییێ یەكان دا(الاحـاد) دەیهێننەوە ، لە كاتێدا كەكۆڕا (الإجمـاع) ی زانایـان هەیە لەسەر ئەوەی كە فەرموودەی (ئاحاد) بەڵگەیەكی گوماناویە لە ڕووی چەسپان (ثبـوت) ە وە هـەر چـەند واتاكەیشی گەیاندنێكی یەكلا كەرەوە (الدلالة القطعیة) بگەیەنێت .**

**٩- دروست نیە ئیجماع لە مەزهەبێكـدا تێكـەڵ بكرێـت لەگـەڵ ئیجماعێكـدا كەتـەواوی موجتەهیـدانی ئـەم ئوممەتـە لەسـەر دەمێـك لـە سـەردەمەكاندا دوای كۆچـی دوایـی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) كردبێتیـان لەسـەر حوكمێكی شەرعی، ئەمەی دووەمیان دەبێتە بەڵگەیەكی مولزیم ، بەڵام یەكەمیان وانیە .**

**١٠- ناكرێت شەریعەتی ئیسلام وفیقهی ئیسلامی تێكەڵ بكرێت .**

**١١ - شەریعەت بریتیە لە دەقە كانی قورئان و سوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ)كـە نـەمرە و پێویـستكارە ولەسـەر هـەموو بـاڵغێكی عـاقڵ لـەڕووی بـیرو بـاوەڕو كـردارو ئاكـارەوە ، بـەڵام فیقهـی ئیـسلامی ئـەو ڕاڤـەو ڕاو ئیجتیهادەیە كە زانایانی موسڵمان كردویانـەو ووتویانـە كـە دەسـت دەدات بـۆ هـەمواركردن و گۆڕانكـاری و پێویست كار(ملـزم) نیە بۆ هیچ كەسێك بە شێوەیەك كە پابەندبێت پێوەی بە درێژایی ژیان بەوەی كـە یاسـای (العامی لامذهب له)پێویستی دەكات.**

**١٢ - به ڕاستی هیچ یەکێك لە پێشەوای موسوڵمانان (خوای لێڕازی بێت)نەی ووتوە کە هەموو ڕاستیەکان لە ڕاکانی ئەودا کۆبونەتەوەو هەڵەکانیش پشکی غەیری ئەوون .**

**ئەگەر ڕاستیەکان هەر هەموو یان پشکی پێشەوایەك یان چەند پێشەوایەکی تایبەت بونایە ، پێچەوانەو لەقسە دەرچونیان دەبووە تاوان و لەڕوی شەرعیەوە دروست نەدەبوو ، بەڵکو بۆ خۆشیان دروست نەبوو پێچەوانەی یەکتر ڕایان دەر ببڕایە و لەنێو خۆیاندا ناکۆك بونایە . ئەمەی لای خوارەوەش جەخت لەسەر ئەو واتایە دەکاتەوە و ئەو مانایە دەگەیەنێت :**

**أ- گەورەمان ئەبوبکری صدديق (خوای لێڕازی بێت)کاتێك کە پرسیاری لێکرا سەبارەت بەلەفزی (کلالـة) بەوە لێکیدایەوە کە : (الذی یورث کلالة هو من لیس في ورثته ولد ولا ولد)ـ (الترکة و المیراث في الاسلام) ی د.محمد یوسف موسی ٢٤٥/ ـ واتە : ئەوەی کە میرات دەدات بە (کلالة) ئەو کەسەیە کەلە میرات گرەکانی دا نەکوڕ هەیەو نە باوك ، ووتی :(ئەمە ڕای منە ئەگەر پێکابێتم ئەوە لە خواوەیە ، وە ئەگەر هەڵەشم تیایدا ئەوە لە شەیتانەوەیە)**

**ب- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لە گەورە زانایانی هاوەڵان(خوای لێڕازی بێت)ی پێغەمبەر (ﷺ)کاتێك پرسیاری لێدەکرێت سەبارەت بە ئافرەتێك مارەیی بۆ دیاری نەکراوە و مێردەکەی مردووە پێش گواستنەوەی ، لە وەڵامدا دەڵێت :(من بەڕای خۆم ئیجتهاد دەکەم ئەگەر لەسەر ڕاستی بم و پێکابێتم ئەوە لە خواوەیە وەئەگەر هەڵەشبم تیایدا ئەوە لە کوڕی دایکی بەندەیەکەوەیە کە میرات و مارەیی هەیە وەك ئەو بێ زیاد و کەم).**

**ج- پێشەوای گەورە (ئەبو حەنیفە) (خوای لێڕازی بێت)دەفەرمووێت :(ئەمە ڕای منە وە ئەوە باشترینی ئەوەیە کە پەیمان پێ بردووە و توانامان بەسەریدا شکاوە، هەرکەسیش لەمە چاکترمان بۆ بهێنێت وەریدەگرین وقەبوڵی دەکەین).**

**د- پێشەوا مالیك یش (خوای لێڕازی بێت)داواکاری خەلیفەی عەبباسی ڕەددەکاتەوە کە داوای دەکرد کتێبەکەی (الموطأ) ببێتە سەر چاوەی کار پێکردنی مسوڵمانان و ووتی : (ئەی پێشەوای موسڵمانان شتی وا مەکە چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)بڵاوبونەتەوە بەناو شارو شوێنەکانداو زانست و زانیاریان هەڵگرتووەو گێڕاوبانە). وە کاتێك کە حوکمێکی شەرعی هەڵدەگۆزی بە هاوەڵانی دەووت : (جوان سەیری بکەن و لێی وورد ببنەوە چونکە ئەمە دینە ، وە هەموو کەسیش لە قسەکانی وەردەگیرێت و ڕەد دەکرێتەوە جگە لە خاوەنی ئەم گۆڕە پیرۆزە) ئاماژەی بە گۆڕی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەکرد.**

**هـ- لە پێشەوا (شافیعی)یە وە (خوای لێڕازی بێت)هاتووە : (هەرکاتێ فەرموودەیەك ڕاست بوو هەر ئەوە مەزهەبی منە و قسەکانی من فڕێبدەنە پشت دیوارەکانەوە)**

**و-پێشەوا (أحمد) (خوای لێڕازی بێت)بەر پەرچی ئەوەی دەدایەوە کە ئیددیعای ئیجماع دەکرا لەو شوێنانەی اجتیهادیان لێ دەکرێت و دەیفەرموو: (ئەو چوزانێت کە خەڵکی بڕیاری پێچەوانەو هەڵوێستی**

دژیان دەر بڕیوە بەڵام بەئەم نەگەیشتووە؟) سەرەڕای ئەوە کە زانایان یەك دەنگن لەسەر ئـەوەی کـە حـوکمی قـازی لـە هەربابـەتێکی جـێ ی مـشتومڕدا (المسألة الخلافیة) ناکۆکیـەکان یەکلادەکاتـەوە و هـەموولا لەسەریان پێویست دەبێت کاربکەن بەحوکمی قازی.

شتێکی ڕونیشە کە بڕیاری یاسا بەهێزترە لە بڕیاری قازی ، دەی خۆ یاساکانی تێکڕای وڵاتانی ئیسلامی یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە لە تەڵاقدا ئەگەر ژمارەی لەگەڵدا بێت تەنها یەك تەڵاقی پێدەکەوێت .(ئیترئەم خیلافە بۆ ؟)

١- ئیجتیهادی عومەری کوڕی خەطاب (خوای لێڕازی بێت)لـەوەوە سـەر چـاوەی گرتـووە کـە : گـەورەمان عومەر ئەو کەسایەتییە مەزنەیە کە پێغەمبەر (ﷺ)دەربارەی فەرموویەتی (ئەگـەر دوای مـن پێغەمبـەرێك بهاتایە ئەوە عمر دەبوو)!!

وە ئەو دانایەیە کە دوژمنەکانی گەواهی زانیاری ودانایی وسیاسەت وکارامەیی بۆدەدەن سـەرەڕای ئـەو پلـە بەرزە ئاینییەی کە هەیەتی کەئەو (وەك بە ڕونی دەردە کە وێت لە فەرمودەکەی (ئیبنوعەبباس) دا لەووتـەی ئەو زانایانە ی کە تاوتوێی ئەم بابەتەیان بێ دەمارگیری کوێرانە کردوە) (عومەر) کاتێك بینی کە خـەڵکی دەستیان کردوە بە فڕێدانی تەڵاقی (سێ بە سێ بەیەکجار) بـەری لێگـرتن وسـزای دان، وە لەکاتێکـدا کـە سزا دانە کە سودی نەبوو پابەندی کردن بە هەر سێ تەڵاقەکەوەو پێـی فـەرموون : هەرکەسـێ تـەڵاق بـدات بەپێچەوانەی ئەوەی کەلە شەرعی خوادا هەیە کە تەڵاق لە دوای تەڵاقە ، وەهەرسیانی کۆبکاتـەوە لـە (یـەك جار) دا ئەوا سزاکەی بریتیە لە نەگێڕانەوەی خێزانەکەی بۆ لای تا شو نەکاتەوە بە کەسێکی تر.[1]

عومەری کوڕی خەطاب زانایەکی شارەزا بوو بە فیقهی ئیـسلامی موجتەهیـدێکی بـوێر بـوو کـە ڕەچـاوی بەرژەوەندی گشتی دەکرد لە ئیجتیهادەکانیدا زیاتر لەوەی کە بژمێرێت و حسێب بکرێت ، وەك بونیاتنانی دیوان ، دروست کردنی زیندان بۆ تاوان بـاران ، ڕاگرتنـی بەخـشینی زەکـات بەدەسـتەی (مؤلفـة القلـوب) کاتێ کەبینی هۆکاری حوکمەکە گۆڕاوە ، گێڕانی سزای مەیەخۆر بە هەشتا جەڵدە لە بری چـل ...لـە مـەوە دەر دەکەوێت ئەم کارەی عومەری کوڕی خەطاب دەچێتە خانەی سیاسەتی شـەرعی و بـەدەوری بەرژەوەنـدی گشتیدا بە مانی و نەمانیەوە دەسـوڕێتەوە ، وە نابێتـە کردارێکـی تەشـریعی وا کـە ئاوەڵنـاوی بـەردەوامی

[1] ئیبنو تەیمیە دەڵێت .( لە کاتێکدا کە خەڵکی پابەند نەبوون بە سێ جارەوەو خۆیان توشی حەرام دەکرد پێـشەوا عومـەر وای بـە چاك زانی کە پابەندیان کات پێوەی چونکە ئەوان گوێ ڕایـەڵی خـواو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)نـەبوون لەگـەڵ مانـەوەی گرێبەسـتی نیکاحیشدا بەڵام زۆرێك لە هاوەڵان و تابعین بە ڕویا دەوەستانەوە هەرکەس ئەوەی بووتایە جا یان لەبەر ئەوەی ئەو سـزا دانـەیان پـێ چاك نەبوو یان لەبەر ئەوەی شەرع دانەر لەو جۆرە تۆڵەی نەسەندووە ئەمـە ئەگەر بۆ کەسێك شایەنی تۆڵـە لێـسەندن بێـت بـەڵام خـۆ کەسێك شایستە بە تۆڵە نەبێت بەهۆی نەزانی یان لێکدانەوەیەکەوە ئەوە هیچ نامێنێتەوە بۆ پابەند کردنی بـەوەی کـە خـۆی کـەتنی داوە لە خستنی سێ بە سێ کەی ) فتاوی ابن تیمە (٣٣/١٦)

**بدرێتە پاڵ ، چونکە ئەمە تەنها بۆ قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری ئازیزە (ﷺ). ئەمەو هەر چوار پێشەواکە (خوای لێڕازی بێت)کەوتونەتە ژێرکاریگەری ئەم ئیجتیهادەی پێشەوا (عمری کوڕی خطاب) وەو (خوای لێڕازی بێت)فتوایان داوە بەگوێرەی فتواکەی ئەو.**

**(من دڵنیام ) ئەگەر پێشەوا عومەر جارێکی تر بگەڕابایەوە بۆ دنیا و ئەو پشێوی و ناکۆکییەی بە چاوی خۆی بدیبا یەلە مەسەلەی هەنگاونان بۆ خستنی تەلاقی (سێ بە سێ بەیەك جار) بەگومانی ئەوەی کە کارێکی شەرعیەو قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)رێیان پێداوە ، بە دڵنیاییەوە پاشگەز دەبوە وە لە ئیجتیهادەکەی خۆی و، بڕیاری بەو شێوەیە دەر دەکرد کەلەسەردەمی پەیام و لە جێ نشینی ئەبوبەکر و دوو ساڵی سەرەتای فەرمانڕەوایی خۆیدا کاری پێ دەکرا .**

**(والله أعلم بالصواب)**